# کەمال مەزهەر و ناخی مێژوو



نیگاری : وەهبی ڕەسوڵ

مانگنامەیەکی ڕۆشنبیرییە و هەر ژمارەی تایبەتە بۆ داهێنەرێک
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات

# کەمال مەزهەر

شێرکۆ بێکەس

هەموو هەموو بەیانیانێ
کە هێشتا هەتاو نووستووەو
هێشتا دیجلە خەواڵووە و. دار خورماکان
لەناوتەمدا باوێشک ئەدەن
ئەو حەڵئەسێ. لەگەڵ ئەورەسد! هەڵئەسێ و
لەژووری وشەی بێداردا
بەرامبەر ئاوێنەی عەشقێ رائەوەستێ
پەنجەرەیەک لەناو سەریا ئەکاتەوەو
بە ئەسپایی دەست ئەبات و
برشنگی مێژوویەک ئەگرێ و
بێی ئەنووسێ!.
هەموو هەموو بەیانیانێ
ئەو حەمێکی رووناکمانەو
لەناخی فرمێسک و شیعر و لەناودەنگماندا ئەرسکێ.
کزدایەو هاژە هاژە و نمەی بارانەو ئەپرسێ.
گومانێکەو لەسۆراخی یاقووتەکانی راستیدا
لەسێڵەی هەموو دێرێکدا دائەگیرسێ.
هەموو هەموو بەیانیانێ
ئەبێ بەباڵندەی مێژووی نێو زەمانێ
ئەبێ بەکاریزکەی کتێب و بەدرەختی جێ زوانێ.
لەهەر کوێ بێ
وەک مێژەری "شەرەفخان"و
هەوری سەر بیرەمەگرون و سدارەکەی "ئەمین زەکی"
ئەیبینین و وەکوو "لاوک" ئەیبیسین و
ئەویش ئێستا لەتەنیایی ژوورەکەیدا
کوردستانی بەدەرزیەک داوە لەسەر دڵی خۆی و
کەچاو ئەنێ بەبرینی کێوانەوە
هەڵئەبجەین و کۆچڕەوین و
لەهەرکوێ بین ئەمانبینێ!.
هەموو هەموو بەیانیانێ
ئەم قەڵەمی کازیوەیە
بەڵگەنامەی ئازارێکمان ماچ ئەکات و
گوڵە مێخەکێ زێڕ بەردە قارەمانێ
لەدیرۆکمان ئەکاتەوەو
بەرۆحیەوە ئەینووسێنێ.
هەموو هەموو بەیانیانێ!.

1999 6 26

دەستەی راوێژکاران
حسێن عارف
رەووف بێگەرد
رێبین ئەحمەد هەردی

سەرپەرشتی گشتی
شێرکۆ بێکەس

بەڕێوەبەری رۆڤار
دڵشاد عەبدوڵڵا

ئەندامانی کارگێری
عەتا محەمەد
فەرهەدون پێنجوێنی

سەرپەرشتی هونەری
قادر میرخان

3

5/7/1999

## هونەرمەند وەسفی رەسوڵ ئەحمەد

- ساڵی 1963 لەسلێمانی لەدایک بووە
- 1986 ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی بەغدای تەواوکردووە
- لە 1992 ەوە تائێستا مامۆستای لقی نیگارکێشانە لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی
- 1982 یەکەم پیشانگای لە سلێمانی کردەوە دواتر لە 1986 و 1987 و 1994 و 1995 و 1997 لەشارەکانی بەغدا، سلێمانی، هەولێر، دهۆک پیشانگای کردووەتەوە
- لەفیستیڤالی شێوەکاری 1995 و فیستیڤالی هونەری شێوەکاری لاوان لەهەمان ساڵ و لە پیشانگای پۆستەری هەڵەبجەی شەهید داخەڵات و بڕوانامەی وەرگرتووە
- ئەندامی یەکێتی هونەرمەندانی کوردستان و گرووپی هاوڕێیانی شێوەکارە
- [illegible] پێشانگای لەسلێمانی

**روونکردنەوەیەکی پێویست**

کۆکردنەوەی کۆلێژێک لەنووسین و لێکۆڵینەوەکانی مامۆستای زانا کەمال مەزهەر لە دووتوێی "رۆڤار"دا کەژمارەی لایەرەکانی دیاریکراوە، کارێکی زەحمەت بوو، لێ خۆ ئەشدەکرا لەهەربوارێک لەبوارە سەرەکیەکانی نووسینی ئەم زانە وتارێک هەڵئەبژێرین. بۆیە بەناچاری بەشێکی زۆری بەرلاوێژەکانمان قرتاند و بەتەنیا وتارو لێکۆڵینەوەکانمان بڵاوکردەوە، لەگەڵ داوای لێبوردن لەهەموولایەک. خوێنەری خۆشەویست کاتێ پێویستی بەزانیاری زیاتر بوو دەربارەی پەراوێزەکان دەتوانێ بچێتەوە سەرسەرچاوە راستەقینەکانی وتارەکان

رۆڤار

(رۆڤار) مانگانەیەکی رۆشنبیریەو هەر ژمارەی تایبەتە بەدامێنەرێک
ناونیشان: سلێمانی. قولکەی یەکگرتن. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ـ رۆڤار ـ ت: 29839
لەدەرەوەی کوردستان:
TEL: 0044 162 846008 Fax: 0044 162 84 77660



# کەمال مەزهەری زاناو

## مێژوونووس

من ئەو ئازادیەم

کە لۆمەی خۆی دەکا

14/ شوباتی 1937 لەئاغجەلەری سەر بەپارێزگای کەرکوك لەدایك بووە، لەسلێمانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و دوا ناوەندی تەواو کردووە.

بەکەلۆریۆسی لەمێژوو بەپلەی شەرەف سالی 1959 لەزانکۆی بەغدا وەرگرتووە.

سالی 1960 چۆتە روسیاو لەپەیمانگای رۆژهەلاتناسی سەر بەئەکادیمیای زانستەکانی سۆڤیات پلەی دکتۆرای سالی 1963 وەرگرتووە و سالی 1969 دکتۆرای ناوك (زانستەکان .D. S. C)ی لە هەمان پەیمانگا وەرگرتووە. یەکەم کوردو یەکەم عێراقی و هەروەها لەرۆژهەلاتیش یەکەم کەس بووە ئەو بڕوانامەیە وەربگرێ.

لەنێوان ئەیلولی 1959 و ئازاری 1960 مامۆستای ئۆتاغی دواناوەندی بووەو لە تەموزی 1970 یشەوە تائێستا مامۆستای بەشی مێژووە لەکۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا.

لەنێوان 1971 1975 ئەمینداری گشتی کۆڕی زانیاری کورد بوو.

کتێبەکانی:

- کوردستان لەسالەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا (بەغدا- 197٤، چاپی دووەم: مەهاباد- ئێران 1981)
- تێگەیشتنی راستی و شوێنی لەرۆژنامەنووسی کوردیدا (بەغدا- 1978)
- ئافرەت لەمێژوودا (بەغدا 1981، چاپی دووەم: سوید 1996)
- مێژوو، کورتە باسێکی زانستی مێژوو و کورد و مێژوو (بەغدا- 1983)
- رێنیسانس (بەغدا 1984)
- چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی گەلی کورد (بەغدا 1985 و چاپی دووەم: ستۆکهۆلم 1991)
- چینی کرێکارانی عێراق (بەغدا 1986)
- مێژووی مەهاباد (ئامادەیە بۆچاپ)
- ثورة العشرين فى الاستشراق السوفيتي (بەغدا 1977)
- اضواء على قضايا دولية فى الشرق الاوسط (بەغدا 1978)
- دور الشعب الكردي فى ثورة العشرين العراقية (بەغدا 1978)
- النهضة (النهضة الاوروبية) (بەغدا 1979)
- الطبقة العاملة العراقية التكوين و بدايات التحرك (بەغدا1984)
- ميكافيللي و الميكافيلليه (بەغدا 1984)
- دراسات فى تاريخ ايران الحديث و المعاصر (بەغدا 1985)
- موجز تاريخ اوروبا الحديث (لەژێر چاپدایە)
- مذكرات احمد مختار بابان آخر رئيس وزراء عراقى فى العهد الملكى (ئامادەیە بۆ چاپ)

کتێبەکانی بەزمانی روسی:

1- Natsionalno Osvoboditelone Dvijenie v Irakskom Kurdistane (1918 1932), Izd. Acad. Nauk, Baku, 1967.

2- Veliki i Oktiabr i Osvoboditelnaya Borba Narodov Blijnevoi i Srednevo Vostoka (Sovmestno, Izd. Acad. Nauka, Baku, 1967).

3- Natsionalno-Osvoboditelnoe Dvijenie v Irakskom Kurdistane v 1918-1958 gg., Izd. Nauka, Moscow, 1969 (Aft. Dok. Diss.)

4- Formirovanie Rabochevo Classa stran Azii I Afriki (Sovmeston), Izd. Xauka, Moscow, 1971.

کتێبەکانی بەزمانی ئینگلیزی:

1- Annazids (Banu Annaz), Encyclopedia Iranica ,

Vol. II, London, Boston and Henoley, 1985.

2- Kurdistan During The First World War, Saqi Books, London, 1991.

کتێبەکانی بەزمانی تورکی:

1- Prof. M.A.Hasretyan, Dr. Kamal M. Ahmad, M. Ciwan, 1925, Kurt Ayaklanmasi (Sheyh Sait Hareketi), Uppsala, 1985.

2- Birinci Dunya Savashi Yillarinda Kurdistan ve Ermeni Soykrimi, Stockholm, 1986.

کتێبەکانی بەزمانی فەرەنسی:

1- Les Kurdes et genocide des Armeniens, traduit du Kurde par Halkawt Hakim (Sous Presse).

کتێبەکانی بەزمانی فارسی:

- ماهیت قیام سال 1925 کردستان ترکیه، الفبا (پاریس 1989)

- زن در طول تاریخ (مختصر تاریخی و اجتماعی) سوید 1994.

وەرگێڕانەکانی:

- البروفیسور ف. مینورسکی، الاکراد احفاد المیدیین (لەروسی‌یەوە بۆ عەرەبی 1973)

- ا. شامیلوف، حول مسالە الاقطاع بین الکرد (لەروسی‌یەوە بۆ عەرەبی 1977، چاپی دووەم: 1984)

- زیاتر لە 200 لێکۆڵینەوەو وتاری لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا بڵاوکردۆتەوە وەکو:

کۆڕی زانیاری کوردو رۆشنبیری نوێ و بڵێسەو کاروان و رۆژی کوردستان و هاوکاری برایەتی (التاخی)، تووتن، بەیان، رەنگین، افاق عربیة، الثقافة، العراق، الثقافة الجدیدة، دراسات فی التاریخ والاثار، ئاسیا و ئەفریقیای ئەمڕۆ بڵاوکردۆتەوە

پێشەکی بۆ دەیان کتێب نووسیوەو بەدەیان لێکۆڵینەوە و کتێبی زانستی داچۆتەوەو هەڵیسەنگاندوون گرنگترینیان:

- شەرفخانی بەدلیسی.
- بابان، سۆران، بۆتان.
- عێراق لەسەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا.
- یاداشتەکانی فوئاد عارف.

بەشداری لەچەندین کۆنگرەو کۆبوونەوەو کۆڕی زانستی دا کردووە لەوانە گرنگترینیان:

- کۆنگرەی نێودەوڵەتی بۆ مێژوو، لەبەغد ئازاری 1973

- کۆنگرەی رۆژهەڵاتناسی نێودەوڵەتی لە پاریس، تەمووزی 1973 و لەوێ لێکۆڵینەوەیەکی پێشکەشکرد "دەربارەی گیروگرفتەکانی لێکۆڵینەوە لە مێژووی کوردو ئەرکەکانی کۆڕی‌زانیاری کورد".

- کۆڕی "کێشەی کۆیلە لە ئەفریقیا" تونس حوزەیرانی 1985 لەوێ لێکۆڵینەوەیەکی خوێندەوە "سەرمایەداری و بازرگانی کردن بە کۆیلە".

- کۆنگرەی کوردو شار، شارەکان لەکوردستان داو کورد لەشارەکاندا- سیڤەر، پاریس ئەیلولی 1996.

- کۆڕی پەیوەندی نێوان عەرەب و ئێران لەدۆحە ئەیلولی 1995.

چەندین خەڵاتی رێزلێنانی پێ بەخشراوە لەبەرامبەر هەوڵەکانی لەبواری زانستی مێژودا.

بەپێی دواهەواڵ کەلە گۆڤاری "رەنگین"دا بڵاوکراوەتەوە پلەی "عالم"ی وەرگرتووە.

خاوەنی کتێبخانەو ئەرشیفێکی دەوڵەمەندەو ئێستا لەبەغدا دەژی

مێژوو نووسی عێراقی بەناوبانگ عبدالرزاق الحسنی دەربارەی کتێبی "کوردستان لەساڵەکانی شەری یەکەمی جیهاندا" دەڵێ:

وەکو مێژوو نووسێک زۆر شاگەشکەبووم لەبەرامبەر ئەو هەموو زانیاری‌و ئەو هەموو سەلیقەی لەو کتێبەدا هەبوو، کە هاوتای نییە لەسەرچاوەکانی تری عەرەبی و جیهانی‌دا.

تائێستا سەرپەرشتی نزیکەی (40) نامەی دکتۆراو ماجستێری کردووە، هەروەها وەکو ئەندام گفتوگۆی (60) یشیان بەشداربووە.

کەمال مەزهەر پێی وایە، ئەوەی کۆمەڵ بەرەوپێش دەبا خێزانە ئۆرۆستوکراتە زلەکان نین، بەڵکو چینە کۆمەڵایەتی‌یەکانی ناوەراست و خوارەوەن. لەگەڵیان و لێکۆڵینەوەکانی‌دا ناخی مێژوو دەخوێنێتەوە نەک توێژاڵ.



لەڕاستەوە بۆ چەپ شاعیری کوردی ئازەری دڵسۆز شامیل عەسکەروف (باوکی خانی) کەنامەی دوکتۆراکەی دەربارەی جگەرخوێنە، پرۆفیسۆر کوردۆییف، کەمال مەزهەر، دوکتۆر رەحیمی قازی. ساڵی 1964 لەشورەوی.

بەسەردا داسەپاندبوون. تەنانەت هەندێك سەرچاوە باسی ئەوەیان کردووە چۆن لەهەندێك ناوچەدا شەوی بووکێنیی کچە ئەرمەن بۆ ئاغای کوردبووە(؟؟).

لەڕاستیدا ئەوەی ئاغای کورد بەسەر وەرزێری ئەرمەندا فەرزی کردبوو تەنانەت زۆر لەوەش زیاتر بوو کە بەسەر وەرزێری کوردەوە بوو بەبار. لەم بارەیەوە زرووفیش یاریدەیەکی زۆری ئاغا کوردەکانی دەدا، بە تایبەتی ئەوەی کە سوڵتان عەبدولحەمید بەئاشکرا هانی دەدان و چاوی لە زوڵم و زۆریان دەپۆشی و تەنانەت یاریدەی تەختی و مەعنەویشی دەدان بۆ ئەوەی زەوی و زاری ئەرمەنەکان زەوت بکەن. جیاوازیی ئاینیش، واتە(کافرێتی) ئەرمەنەکان، ئەوەندەی تر دەستی زوڵمی ئەوانی درێژ کردبوو. لەهەندێ ناوچەدا کۆیلایەتیی ڕاستەقینە هەبوو، وەرزێرە ئەرمەنەکان بەناوی ئاغاکانەوە نووسرابوو، وەك کۆیلە دەکڕران و دەفرۆشران. ئەکادیمی ف. گەردلێڤسکی کە چارەهای چار بەر لە شەڕی یەکەم و لە ساڵەکانی شەڕدا بە زۆر ناوچەی ئەرمینیاو کوردستاندا گەڕاوە و بە چاوی خۆی باری قورسی ژیانی ئەرمەن و زۆرداریی بێ ئەندازەی دەرەبەگی کوردی دیوە- نووسیویەتی دەڵێ: ((ئەرمەنیی لە زەویی کوردا دەژیا، وەك کۆیلە دەکڕدرا و دەفرۆشرا، دەبوو کار بۆ دەرەبەگی کورد بکات و قەت بە بەبیریا نەدەهات ئازادیی لە شوێنێکدا هەبێ، هەرچیی کۆیلایەتی و ژێر دەستەییشی بوو بە لایەوە بووە ژیانێکی ئاسایی)).

دیارە ئەم هەموو زوڵم و زۆرداریە، زەوت کردنی زەوی و زار بووبوونە هۆی دروست بوونی رقێکی گەورە و رەوا لەدڵی کۆمەڵانی خەڵکی ئەرمەنستاندا بەرامبەر دەرەبەگ و دەرەبەگایەتیی کورد و پریشکی ئاگری ئەو رقە جار و بار بەهۆی هاندەرەوە تەنانەت پەیوەندیی نێوان هەردوو گەلیشی دەگرتەوە. هەر هەمان گەردلێڤسکی لەم بارەیەوە دەڵێ: ((کاربەدەستان دەرەبەگە کوردەکانیان فێر دەکرد بە چاوی مانگای دۆشەنیی((بقرە حلوب)) سەیری ئەرمەن بکەن. هەرچی میرییش بوو لەوەدیو پەردەوە سەیری ئەمەی دەکرد چونکە دوژمنایەتی کورد و ئەرمەن لە مەسڵەحەتی بوو))، بۆیەکا_ وەك دەڵێ_ هەمیشە پەیڕەویی سیاسەتی((فرق تسد))ی لەگەڵ دەکردن.

بێگومان هەموو لێکۆڵینەوەیەکی ڕاستییانەی پەیوەندیی نێوان کورد و ئەرمەن لە سەردەمی نوێ و هەرە توێندا پێویستیی بە رەچاوکردنی ئەم دوو لایەنە هەیە، واتە ئەو هۆیانەی ئەرمەن و کوردیان لێك نزیك و ئەوانەی لێکی دوور دەخستنەوە. رەچاو کردنی ئەمەش لە هەموو شتێکی تر بۆ کاتی لێکۆڵینەوەی دەوری کورد لە کوشتاری ئەرمەندا پێویستە، چونکە لە ڕاستیدا چەند هۆیەك_ وەك لە دواییدا باسی دەکەین_ کارێکی وایان کرد کوردیش تا رادەیەك تێکەڵی ئەو کوشتارانە بێ. ئەم مەسەلەیەش کە لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا گەیشتە بەرزترین پلەی، بایەخێکی مێژوویی گەورەی هەیە هیچ ئەبێ چونکە کورد زیاد لە پێویست و واقیع تاوانبارکراوەو ئەو کوشتارانە تا رادەیەك بوونەتە هۆی زڕاندنی ناوی لە ئەورووپادا. زۆربەی ئەو نووسەرە رۆژئاواییانەی باسی ((خوێنڕێژی)) و((چەتەگەریی))و ((دڕندەیی)) کوردیان کردووە ئەم مەسەلەیە کاری تێکردوون، ئەویش چونکە تارەکوو ئێستە بە تەواویی نەخراوەتە قاڵب و چوارچێوەی راستەقینەی خۆیەوە، بۆیەکا وا لێرەدا بەپێی توانا بایەخی پێدەدەین.

* * *

ئەرمینیای رۆژهەڵات هەر کە بوو بە بەشێك لە رووسیا، لە ئەرمینیای رۆژئاوا و بەڵکو لە هەموو بەشەکانی تری دەوڵەتی عوسمانی زیاتر کەوتە پێشکەوتن و گەشەکردن. ئەمەش کارێکی زۆر ئاسایی بوو-مەودای گەشەکردن و پێشکەوتن لە ژێر سایەی دەوڵەتێکی ئەورووپاییدا زیاتر بوو ەك لە ژێر سایەی دەوڵەتێکی ئاسیایی دواکەوتوودا. ژیانی رووناکبیری ئەو بەشەی ئەرمینیا خێراتر کەوتە سەر باری پێشکەوتن(17). هەر ئەم بەشە زۆر خێراتر لە ئەرمینیای رۆژئاوا تێکەڵی بازاڕی سەرمایەداریی بوو و لە بناغەی کۆمەڵگاکەیدا پەیوەندیی وچین و دەستەی نوێ سەریان هەڵدا، بەتایبەتی چونکە کشتوکاڵ و پیشەسازیش هەر لەئەنجامی ئەوەداخێراتر کەوتنە گەشە کردن. بۆنموونە لەماوەی دەساڵدا(لە ساڵی 1880 وە تا ساڵی1890) بەرهەمی مس لە ئەرمینیای رۆژهەڵاتدا پێنج جارو نیو زیادی کردو لەماوەی شازدەساڵی داهاتوودا شەش جاری تر زیادی کرد. بەرهەمیی کۆنیاك لەماوەیەکی کەمدا دەورووبەری چل ئەوەندە زیادی کردو لەگەڵ شەرابی ئەرمەنیدا رووی کردە گەلێك بازاڕی دەرەوە. پیشەسازیی قوماشی لۆکەشی زۆر بەخێرایی پێش کەوت. لە رووی کارگێڕیشەوە دوای ئەوەی لە حوزەیرانی ساڵی 1849دا حاکمیەتی یەریڤان دامەزرا باری ژیان و دەوری ئەرمەن گەلێك لە جاران باشتر بوو.

بەم جۆرە جگە لەئایین لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە هۆیەکی بزوێنەری گرنگی تر هاتە کایەوە بۆ ئەوەی ئەرمەنەکان چاو بڕنە رووسیاو زیاتر لە جاران بەڕق وکینەوە سەیری سیاسەتی سوڵتانە عوسمانیەکان بکەن. ساڵێك زیاتر بەسەر ئەوەدا تێنەپەڕی کە ئەرمینیای رۆژهەڵات بووە بەشێك لە رووسیا کاتێك دەورووبەری (90)هەزار ئەرمەن سنووری دەوڵەتی عوسمانییان بڕیو چونەئەودیو. گەلێك لەسەردارەکانی ئەرمەن بەر لەوەو دوای ئەوەش بەنامەو لەزۆر رێگەی ترەوە داوایان لەچارەکانی رووسیا دەکرد دەستی یاریدەی هەمەجۆر بۆ ئەرمەنەکان درێژ بکەن. لەکاتی ئەو شەڕانەشدا کە لەنێوان رووسیاو دەوڵەتی عوسمانیدا روویان دەدا ئەرمەنەکان هەمیشە لایەنی لەشکری رووسیان دەگرت. لەکاتی شەڕی ساڵی 1877–1878دا گەلێك ئەرمەن بەچەکەوە دایانە پاڵ لەشکری رووس و زۆریارمەتیی بەکەڵکیان پێشکەش کرد.

ڕووسیاش لەلایەنی خۆیەوە درێغیی نەکرد، چاوی تەماعی



بڕیبوو ئەم بەشەی تری ئەرمینیاو بەهەموو جۆر دەیویست هەستی خەڵکەکەی زیاتر بەلای خۆیدا ڕابکێشێ. لەکاتی شەڕی ساڵی 1828–1829ی نێوان تورکیاو ڕووسیادا لەشکری ئەمیان بەشێکی زۆری لەئەرمینیای ڕۆژئاوا بەقارص و ئەرزڕۆمەوە داگیر کرد، بەڵام بەپێی پەیمانی ئەدریانۆپۆڵ ساڵی1829 ناچار بوو بیان گێڕێتەوە بۆ دەوڵەتی عوسمانیی. زۆری نەخایاند دیسان هەمان هەل بۆ ڕووسیا هەڵکەوتەوە، دوای شەڕی ساڵی 1877–1878 قارص وچەند ناوچەیەکی تری ئەرمینیای ڕۆژهەلاتی پێدرا بەپێی پەیمانی نهێنیی سایکس پیکۆش (1916) هەموو ئەرمینیای ڕۆژئاوا بۆ ڕووسیا تەرخان کرابوو.

ئەمە، واتە مەیلی ئەرمەن بەلای ڕووسیاداو هەوڵ و کۆششی ڕووسیا بۆ داگیرکردنی ئەرمینیا، ڕقی فەرمانڕەوایانی دەوڵەتی عوسمانیی بەجارێك لەئەرمەن هەڵساندبوو. لەبریتی ئەوەی کارێکی وابکەن بە پێشخستنی ئەرمینیا دڵی ئەرمەنەکان بەلای خۆیاندا ڕابکێشن بۆ هەلێك دەگەڕان پەل و پۆیان بکەن. پەیدابوون و پەرەسەندنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی ئەرمەن ئەوەندەی تر بووە هۆی قووڵ بوونەوەی ئەو ڕقە. لە هەردوو پارچەی ئەرمینیادا هۆی دروست بوون و بەهێز بوونی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەل لەئارادا بوو، لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا ئەم بزوتنەوەیە لە ئەرمینیای ڕۆژئاوادا زۆر بەهێزبوو و لەچەند ڕاپەڕینێکی چەکدارانەدا خۆی نواند. ساڵی 1862 جوتیارەکانی ناوچەی زەیتوون ڕاپەڕینێکیان دژی جەورو ستەمی عوسمانیێکان بەرپاکرد. ساڵانی 1878و 1884 خەڵکی هەر ئەم ناوچەیە دووجاری تر ڕاپەڕینەوە. ساڵی 1886یش خەڵکی وان ڕاپەڕین. عوسمانیێکان زۆر بە توندی ئەم ڕاپەڕینانە و هەموو بزوتنەوەیەکی تری ئەرمەنیان وەك گەلەکانی تری ژێر دەستیان دادەمرکاندەوە.

یەکێك لەو هۆیانەی ئەرکی دامرکاندنەوەی ئەو ڕاپەڕینانەیان ئاسان دەکرد لاوازییان بوو لە ڕووی ڕێکخستنەوە. ئەوە پاڵی بە ڕووناکبیرە دووربینەکانی ئەرمەنەوە نا بکەونە سەر بیری دامەزراندنی ڕێکخراوی تایبەتیی خۆیان و لەمەشدا تا ڕادەیەك ڕێبازی گەلانی تر ئیکردن. بەم جۆرە ساڵی 1887 حیزبی (هنچاك) (زەنگی کڵێسە(ناقوس) دامەزرێنران کە وەك دوایی باسی دەکەین دەورێکی دیاریان لەمێژووی نوێی ئەرمینیادابینیی.

خەبات و ڕاپەڕینەکانی گەلی ئەرمەن هەروا بێ ئەنجام نەبوون. لەلایەکەوە بوونە هۆی بەرزبوونەوەی هەستی نەتەوەیی کۆمەلانی خەڵکی ئەرمینیا، لەلایەکی تریشەوە مەسەلەی ئەرمەن بووە یەکێك لەو مەسەلانەی دەوڵەتە گەورەکان بایەخیان پێئەدان، ئەویش بەتایبەتی چونکە دەیانزانی لەو ڕێگەیەوە دەتوانن زیاتر دەستبخەنە ناو کار و باری دەوڵەتی عوسمانیی‌یەوە. بەم جۆرە مەسەلەی ئەرمەن وای لێهات لەکۆنگرەو پەیمانە دەوڵەتیێکاندا باس دەکرا. بەندی شازدەی پەیمانی (سان ستیفانۆ)(شوباتی 1878) کەکۆتایی بەشەڕی نێوان ڕووسیا و تورکیا هێنا، بۆمەسەلەی ئەرمەن تەرخان کراوە. لەو بەندەدا بەتایبەتی باسی چاکردنی کار و باری کارگێڕیی ئەو پارچەیەی دەوڵەتی عوسمانی کراوە. دوا بەدوای ئەوە کاتێ لە حوزەیران تەموزی هەمان ساڵدا کۆنگرەی بەرلین گیرا و ژمارەیەکی زۆر لەدەوڵەتە ئەورووپاییە گەورەکان(بەریتانیا و ڕووسیا و ئەڵەمانیا و فەرەنسا و نەمسا)و تورکیا و نوێنەری ژمارەیەك لەدەوڵەت و گەلانی بەلقان تێیدا بەشدار بوون، گەورەی هەموو کڵێسەکانی ئەرمەنیش بە تایبەتی هاتە بەرلین بۆبەشداریی کردن لەو کۆنگرەیەدا. هەرچەنیش ڕێگەی ئەونوێنەرە نەدرا لەکۆبوونەوەکانی کۆنگرەکەدا ئامادەبێت.

بەڵام بەندیی 61ی ئەو ڕێکەوتننامەیەی لەئەنجامیدا مۆر کرا دیسان بۆ مەسەلەی ئەرمەن تەرخان کرا وبەپێی ئەو بەندە دەبوتورکیا ئیسلاحاتی کارگێڕیی لە ئەرمینیادا بکات و زیاتر ڕێگەی ئەرمەنەکان بدات کە خۆیان ئەرکی بەڕێوە بردنی کاروباری ناوچەکەیان بگرنە ئەستۆ وجیاوازی لەنێوان ئەوان و موسڵمانەکاندا نەمێنێ. هەرچەندە ڕێکەوتننامەی بەرلین تاساڵی 1912 لانەبرا بەڵام بەندیی 61 ی یەکێك بو لەو بەندانەی کە جێ بەجێ نەکران. دوای "سان ستیفانۆ" و"بەرلین" چەند جارێکیتر دەوڵەتە گەورەکان مەسەلەی ئارمەنیان هێنایە ناوەو دەیانویست هەروەك وتمان لەڕێگەیەوە دەست بخەنە ناو کاروباری دەوڵەتی عوسمانی یەوە. ئەمەش بۆ خۆی زیاتر ئەرمەنەکانی هان دەدا دژی سیاسەتی چەوتی ئەو دەوڵەتە بوەستن و بۆ سەربەخۆیی هەوڵ بدەن و پەیوەندی لەگەڵ زۆر لایەندا ببەستن.

– بەم جۆرە مەترسی جیابونەوەو لەکیس چونی ئەرمینیای ڕۆژئاواش پەیدا بو. فەرمانڕەوایانی دەوڵەتی عوسمانی زۆر بەمە نیگەران بون، بەتایبەتی دوای ئەوەی گەلە گاورەکانی تری ژێر دەستیان یەك لەدوای یەك لە ئەنجامی خەباتی خۆیان و بە هۆی یاریدەی دەوڵەتە گەورەکانەوە توانییان خۆیان لەحوکمی دواکەوتویان ڕزگار بکەن، بەڵام ئەوان دەرسیان لەمێژو وەرنەگرت و لەڕاستیشدا ئامادەی وەرگرتنی ئەودەرسە نەبون. بۆیە کە لەبریتی چاك کردنی باری ژیانی ئەرمەن وتەهێشتنی چەوساندنەوە و زوڵم وزۆری نەتەوەیی و ئاینی بەسەریانەوە کەوتنە پەیڕەوی کردنی سیاسەتێکی توند و تیژتر لەجاران بەرامبەریان. ئەم سیاسەتە لەسەردەمی فەرمانڕەوایی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمدا (1876–1909) بەجارێك روون و ئاشکرا بور. خولیای قەلاچۆکردنی ئەرمەن کەوتبووە کەلەی سوڵتان عەبدولحەمیدەوە. بە تایبەتی ی خۆی و دەستە و دایرەکەی کردبووە دروشمی سەرەکیی سیاسەتی دەوڵەت. هەر لەبەر ئەوەو چەند هۆیەکی تر بوو سوڵتان عەبدولحەمید دەیویست ناوچە ئەرمەنی یەکانی سەر سنووری روسیا بە موسڵمان بتەنێ. زۆری نەخایاند سوڵتان کەوتە قەلاچۆکردنی ئەرمەنی بێ تاوان. یەکەم کوشتاری درندانە لە ئاب و ئەیلولی ساڵی 1894دا لە ناوچەی ساسۆن ڕووی دا کاتێك سەرباز و جاندرمە و دەستەیەك چەتە کەوتنە گیانی گەورە و بچوك و ژن و پیاوی ئەم ناوچەیەو لەماوەیەکی کەمدا (40) گوندیان کاول کرد و دەورویەری دە هەزار کەسیشیان کوشت. دوا بەدوای ئەمە بەساڵێك کوشتارێکی تر دەستی پێ کرد، بەڵام کوشتاری ئەمجارەیان گشتی بوو. لە ئەیلولی ساڵی 1895 دا لە پایتەخت، لە شاری ئەستەنبوڵدا پیاوەکانی سوڵتان کەوتنە گیانی ئەرمەن و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و گەلێکیان لێ لە بەندیخانە توند کردن. ئینجا کوشتار کەوتە ناو شارەکانی ئەرمینیای ڕۆژئاواوەو ئەو شارانەی ئەرمەنیان تیا دەژیا– ئەرابزۆن و ئەرزرۆم و مەرعەش و وان و دیاربکر و گەلێکی تر. والێرەشدا تەنها چەند نمونەیەکی کەم دەهێنینەوە بۆ ئەوەی ڕووی ڕەش و درندەیی بێ ئەندازەی ئەو کوشتارانە بخەینە بەر چاو تا باشتر لەچوارچێوەی مەسەلەکە بگەین.

لەشاری ئەستەنبوڵ و لەماوەی تەنها دوو ڕۆژدا نزیکەی 5,500 ئەرمەنی کوژران و تەنانەت گەلێك گاوری تریشیان هەر بەناوی ئەرمەنەوە لەناو برد. وەك لە "کتێبی زەرد"ی فەرەنساییدا باسی دەکات کوشتاری ئەرمەن لە دیاربەکردا سێ ڕۆژی ڕەبەقی خایاند (لە ڕۆژی یەکی تەشرینی دووەمی 1895 ەوە). لەم شارەدا بەدەم "سەڵەوات دان"ەوە دەوری سێ هەزار کەس کوژران و نزیکەی 119 گوند کاول کران و تەنها لە ناو شاردا دەس درێژی کرایە سەر ناموسی پەنجا ئافرەت و لە دەرەوەی شار کار بە پەنجاشەوە نەوەستا. پیاوکوژ و جەردەکان یەکێك لەو سێ ڕۆژەیان تەرخان کرد بۆ دوکان و بازارەکانی ئەرمەن و بە ئارەزووی خۆیان کەوتنە کوشتن و برین و تالانی. هەر هەمان "کتێبی زەرد" خەسارەتی ئەرمەنەکان بە (2) ملیۆن لیرەی تورکی لە قەڵەم دەدا. لەو کتێبەدا باسی کوشتاری شاری سیواسیش کراوە کە ژمارەی کوژراوەکانی تا 12ی تشرینی دووەم خۆی داوە لە دەوروبەری هەزار کەس و لاشەی دوو صەد سێ‌صەدێکیان هەر وا لە یەکێك لە خانەکانی شاردا فڕێ درابوون. وەك یەکێکی ئاگادار گێڕاوێتەوە زۆربەی کوژراوەکانی سیواس بە قیمەکێش و دار و ئاسن و خەنجەر و ئەو جۆرە شتانە کوژراون. وادیارە پیاوکوژەکان دڵیان نەهاتووە گولە بەخەسارە بدەن(!!). هەمان کوشتارو تالانی و کاولکاری درندانە زۆر ناوچەی تری گرتەوەو بۆ ساڵی داهاتووش دووبارە بووەوە. بەپێی نامەیەکی نهێنی باڵیۆزی روسیا لە ئەستەنبوڵ کە بۆ وەزیری هەندەرانی روسیای ناردووە لە ئەنجامی ئەو کوشتارانەدا تەنها هەتیوو ژمارەیان گەیشتۆتە (50) هەزار منداڵ

ئەم کارانە کە لە مێژودا وێنەیان کەم دەبینرێ بەجارێك دڵی ئەرمەنیان لەڕژێمی عوسمانی بەگشتی و لە حوکمی سوڵتان عەبدولحەمید بەتایبەتی گرمێ کرد. نیشتمان پەروەرەکانی ئەرمەن بە دڵ کەوتنە پشتگیریی کردنی هێزە سیاسییە ناحەزەکانی ڕژێمی عەبدولحەمید وزۆریان کەوتنە یاریدەدانی بزوتنەوەی تورکە لاوەکان کە "حوریەت و عەدالەت و مساوات"ی کردبووە دروشمی خۆی و گەورەکانی باسی برایەتی و



بەکسانی‌یان دەکرد جاری وا بووە ئەو گەورانە لەترسی پیاوەکانی سولتان عەبدولحەمید لەناو ئەرمەنەکاندا خۆیان شاردۆتەوە، گەلی ئەرمەن، وەك هەموو گەلەکانی دەولەتی عوسمانیی؛ زۆر بەگەرمیی پێشوازی سەرکەوتنی شۆڕشی تورکە لاوەکانی کرد (تەموزی 1908)، بەلام زۆری نەخایاند کە رووی راستەقینەی رژێمی نوێش کەوتە روو و ئەرمەن دیسان بوونەوە بەیەکەم قوربانی. هەمووی سالێك بەسەر دامەزراندنیدا وەرنەچەرخا کاتێك بەجۆرێکی خراپتر پەنای بردەوە بەر سیاسەتەکەی سولتان عەبدولحەمید و لە نیسانی سالی 1909 دا کوشتارێکی نوێی لەشاری ئەدەنە رێکخست و بووە هۆی لەناو بردنی تەنها 30 هەزار کەسی بێ تاوان.

سەیر ئەوەیە کاربەدەستان بەناو ی سزادانی تاوانبارانی ئەم کوشتارەوە و گوایە بۆ ئەوەی "عەدالەت"ی دروشمیان کوێر نەبێتەوە کەوتنە گرتن و پرسینەوە کە ئەنجامەکەی بەم جۆرە بوو: لەشاری ئەدەنە 15 کەس کران بە سێدارەدا، بەلام شەشیان ئەرمەنی بوون. نۆکەسی تر درانە دادگە، بەلام تەنها یەکێکیان موسولمان و ئەو هەشتەکەی تریان ئەرمەن بوون(!!). لەوەش سەیرتر، موسلمانەکە تەنها شەش مانگ حوکم درا و ئەرمەنەکانیش یەکی لە پێنجەوە بۆ دەسال. دوای ئەوە 362 کەسی تر گیران کە تەنها دووصەد و سیازدە کەسیان گاور بوون(!!).

ئەمانە هەموو سەرەتای کار و نیشانەی نیازی خراپی رژێمی نوێی بەرامبەر گەلەکانی ئیمپراتۆری عوسمانیی. بەلام ئەم نیازە دیسان لەبەر چەند هۆیەك بەرامبەر بە ئەرمەنەکان توندو تیژتر خۆی نواند. ئەرمەنەکان، وەك هەمو گەلانی تری ناو دەولەتی عوسمانی، هەلگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهانیان بە هەل زانی بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان و چالاکانە، بەلام وەك داخ لە دلی چاوەڕوانی تۆلە، بۆ ئەم مەبەستە کەوتنە کار. لەزۆر ناوچەی ئەرمینیا لاوی خوێن گەرم کەوتنە رێکخستنی ریزەکانیان و بەشێکی زۆریان چەکیان هەلگرت و دایانە پال هێزە شەرکەرەکانی رووس لە ناوچەکانی قەفقاس و تورکیا وئێراندا. ئەوە بوو لە زۆرلاوە لەشکری تورك شکێنرا. ئەنوەر پاشای سەرلەشکر و تە لعەت پاشای هاوەلی دەبوو "تاوانباری"

ئەم زێرکەوتنانە "بدۆزنەوە" و کەسیش لەو رۆژانەدا وەك ئەرمەن بۆ ئەم کارە دەستی نەدەدا. بەم جۆرە قۆناغێکی نوێی یەکجار رەش و ترسناکی بێ هاوتا لە کوشتاری ئەرمەندا دەستی پێکرد. کوشتاری ئەم جارە لە بەهاری سالی 1915 دا دەستی پێ کرد و سالی داهاتوو کۆتایی‌ی هات. ئەمەش چەند نمونەیەکی زۆر کەمی کارەساتەکانی دوا قۆناغی کوشتاری ئەرمەنە.

نووسەری عەرەب فائز الغصین کە لەو کاتەدا لە تورکیا بووە نوسیویەتی دەلێ: " میری قەصابی بەکرێ گرتبوو، رۆژی یەکی لیرەیەکی عوسمانی دەدانێ. دوکتۆرێ کە ناوی عەزیز بەگ بو باسی ئەوەی بۆ گێڕامەوە چۆن کاتێك لە قەزای مەرزیفونی سەربە سیواس بووە زانیویەتی قافلەیەکی ئەرمەن بۆ کوشتن دەنێررێ و چۆتە لای قایمقام "، دوای ئەوەی قایمقام رێگەی داوە بچێت بۆ سەیر وتویەتی: "چوار قەصابم دی، هەریەکەیان تەورێکی درێژیان بە

دەستەوە بوو، دەرەکەکانیش دە دە ئەرمەنەکانیان جیا دەکردەوە و یەك لەدوای یەك دەیاننارددنە لای قەصابەکان. قەصابەکە بە ئەرمەنی‌یەکەی دەگوت: ملت درێژ کە، دوای ئەوەی ملی درێژ دەکرد وەك مەڕ سەری دەبڕی".

رۆژنامەنوسێك لە سەرەتای ئەیلولی سالی 1915 دا باسی کوشتاری ناو شاری وانی کردووە و چۆن ئەو بەشانەی لەشکری روس کە هاتبوون بۆ داگیرکردنی لە تاو بۆنی لاشە و کەلاك نەیانتوانیبو بچنە ناوشارەکەوە. هەروەها دەقی ئەو بروسکەیەی بلاوکردۆتەوە کە سەرکردەی ئەو هێزانە ناردبوی و تێیدا دەلێ: "سەرتاپای شاری وان کاول کراوە. خانووە باشەکانی سوتێنراون، خانووە قوڕەکانی روخێنراون. شەقام و حەوشەکانی بەلاشەی ئەرمەن و کەلاکی ئاژەل تەنراون. کەلوپەلیش تالان کراون و براون".

لە بەتلیس لە 18 هەزار ئەرمەنی 300-400 ئافرەت و منداڵ بەزیندویتی مابوون. لە 25 هەزار ئەرمەنی ئەرزرۆم دەوروبەری 200 کەسێك نەکوژرابون. لە 25 هەزار ئەرمەنی موش و هەزارەهای تری ئەو سێ صەد گوندەی دەوروبەری، دوای کوشتارەکە تاقە پیاوێکی ئەرمەنی‌یان بۆ دەرمان تێدا نەدەدۆزرایەوە. لە زۆر ناوچەشدا ئەو ئافرەت و مندالانەی نەکوژرابوون لەترسی گیانی خۆیان بوو بوونە موسلمان. مالە هەژاری واش هەبوو "خوا بۆی ناردبوون" و بەسێ و چوار کارەکەری کچە ئەرمەنیان راگرتبوو.

ئەکادیمی ف. ئارلی دوای لێکۆلینەوە و بەراوردێکی ورد و هەلبژاردنی لایەنی کەم دوا ژمارەی خەسارەتی ئەرمەن بەم جۆرە لە قەلەم دەدا: 182 هەزار کەسیان رایانکردۆتە ناوچەکانی قەفقاسی ناو سنوری روسیا، 4200 یان پەنایان بردۆتە بەر میسر، 250 هەزاریان هاتوونەتە سەر ئاینی ئیسلام و دەوروبەری ملیۆنێکیشیان لێکوژراوە. ئەم ژمارانە وەك وتمان بەلایەنی کەمەوە وەرگیراون، زۆربەی هەرە زۆری سەرچاوەکانی‌تر زۆر لەو ژمارەیە

زیـــاتر دەدەن. پرۆفیســـۆر ئیرسیسـیان لـــە ئـــەنجامی لێكۆڵینـــەوەی ســـەدان بەڵگـــەو بەدكۆمێنتی مێژوویی گرنگەوە ئەم ژمارانـــە دەدات: كـــوژراوی كوشـــتارەكانی ســـوڵتان عەبدولحەمید -300 هەزار. كوژراوی كوشـتارەكانی توركـە لاوەكـان- ملیـۆن و نیوێـك. راكـردوو بـۆ قەفقاس و وڵاتە عەرەبیـەكان- 800 هـەزار. هـەرچۆنێك بێـت ئـەو سـەرگەردانیەی بەسـەر ئەرمـەندا هات، ئەو زەرەرو زیانەی لە ئەرمەن كەوت لە مێـژوودا كـەم هاوتـانو- یەكێك لـە لاپـەرە هـەرە رەشـەكانی مێـژووی هـەموو مرۆڤایـەتی پێـك دەهێنن.

زۆر بـــە داخـــەوە كوردیـــش زۆرباكـەم، بـە ئاگایـانی ئاگـا، بەهاتدان یابەئەنقەست دەستی لەم كوشتارانەی ئەرمەندا هەبوو. بەڵام جارێكـا بـەر لـەوەی بگەینـە هەڵسـەنگان وترخـاندنی ئـەم مەسەلەیە با چەند نموونەیەكی كەم لەو بەشداری یە بخەینە بەر چاو.

لە كووشتاری یەكەمدا لە شاری ئورفە مەلا سەعید ئەحمەد ناوێك كە شێخی دەروێشان بووە بەدەستی خۆی رۆژی 28 ی كانونی یەكەمی 1895 "افتتـــاحی" كوشـــتاری ئەرمـــەنی لـــەم شـــارەدا كـــردووە. فـــەرمانی داوە ئەرمـەنی یەكی بێ تاوانیان لەبەردەمدا بۆ راخستووە و بە چەقۆ لە بەر چاوی خەڵكەكە سەری بڕیوە. بەر لەوەش بەچـەندرۆژێك ئـاودارانی شـاری كۆكردۆتەوە و بۆ كوشتنی ئەرمەن هـانی داون چونكـە ((سـەربـڕ دەسـەڵاتی سوڵتان شۆڕتاكەن)).

هـەر لەكوشتاری یەكـەمدا دوو برا لەناوچەی واندا بەناوی عەبدو لحەمید و عەبدولغەفوورەوە بەجوتە 200كەسیان كوشتووە. هاوڕێی ئەم دووا (برایە)، لەخەرپوت زۆر بوون، لەوێش جوتێ برا پترلە300 كەسیان كوشتووە، حاجی بـەگۆناوێكیش بەتەنـــها صـــەدی كوشـــتووە ئاغـاوایـەكیش شـانازی بـەوەوە كردووە كە97ی كوشتووە و بڕیاری داوە قوربانێكـــانی بگەیەنێتـــە تەنها صەد دانە!!

ئاغای كورد بووە قافڵە ئەرمەنی لەجاندرمـەكان كڕیوەتـەوە و دوای ئـەوەی هـەموو شـتێكی لێ زەوت كـردوون ئینجـا كوشـتوونی (بەی مەرجـە جاندرمـــەكان پێیـــان نەفرۆشـــتنەوە)، دوای كوشـــتن سكیان هـەڵدڕیون بـە دوای لیرەو زێـڕدا گـەڕاون. قوربەسـەر ئـەوەی ددانی ئاڵتونی بووە، بەرلەكوشتنی چەند جارێك مردن و ئەو دنیای دیوە.

ف. گـەرد لێفسـكیش لـەم ئارەیـــەوە نوسـیـــویە دەڵێ: (بەچاوی خۆم دیم چۆن كوردەكان لە هاوینی 1916دا بە دەستە ئەرمەنیان بەرەو بتلیس

خستبوورێ، وا دیارە حەیرانی ئەو خەڵاتی پارەیـە بوویـوون كـە كۆمیتەی یەنابەران دەیداتێ.

كوردەكـان ئەرمەنـەكانیان لای خۆیان لە تورك دەشاردەوە، بەڵام وەك بژیاری كۆیلە بەرەو بتلیس دەیانـبردن. لەوەی دەكرد ئەرمەنە تۆقیوەكـان ئیرادەیـان نـەمابێ، یـا بیركورد رێگەی بتلیس نەدۆزنەوە.

بەڕاستی ئەرمەنە جـل شـڕە هیلاكەكان جێی بەزەیی بوون. لە دەموچاویـاندا ئـەو كوێرەوەرییە دەبینرا كـە هـەمووی ئەختێك بوو لەودیوو شاخەكانەوە دیبوویان".

لێرەشـدا دەتوانـین گـەلێك نموونەی تر بهێنینەوە، بەڵام كورد واتـــەنی "مشـــتێك نموونـــەی خەرواریكە".

* * *

ئەمـە بـوو بـە كورتـی باسـی كوشتارەكانی ئەرمەن. هەرئـەمـەش بوو بە كورتی نموونەی بەشداریی كورد لـەو كوشتارانەدا. مەسـەلەی دووەمیان، واتە بەشداریی كورد، پێویستی ی بە لێكۆڵینەوەی قووڵتر هەیە تا بتوانین هەموو رووەكانی و رادەی وەســـێ بزووتنـــەوەكانی دەستنیشان بكەین. ئەم مەسەلەیە لـە روویـەكی تریشـەوە بایـەخی مێژوویـی خـۆی هەیـە چونكـە كاربەدەسـتان-بەتایبـەتی لـە سـەردەمی فـەرمانڕەوایی سـوڵتان عەبدولحەمیدا- دەیانویست ئوباڵی هەموونـەو كوشـتارانە بخەنـە ئەسـتۆی كـوردو بیبەسـتن بـە دواكـەوتوویی و هەسـتی ئـاینیی كوێرانەی ئەوەوە. جا بەر لە هەموو شتێك با لەم مەسەلەیە بكۆڵینەوە

هەر لە سەرەتاوە پێویستە دان بەوەدا بنێین كە هەستی ئاینیی ی كوێرانە ودواكەوتوویی دوو هـۆی گـەورە بـوون پاڵیـان بـە گـەلێك كوردەوە نا لەكاتی ئەو كوشتارانەدا ئەوانیش هەوڵ بدەن دەستی خۆیان بە كوشتنی كافران سەوز بكەن(!!). وەك باسمـان كـرد كـورد هـەبوون بـەدەم ســەڵاواتەوە ئەرمـەنیان ســەردەبڕی. لـێرەدا بمانـەوێ یانەمانەوێ پرسیارێكی رەوا خـۆی بەسەر ملدا ئەدا، چ كورد و چ تورك و چ نەتەوەكانی تری ئەم ناوچەیە بەر لـەو كوشتارانە دواكـەوتووتر بـوون وهەستی ئاینیشـیان زۆر كوێرانـەتر بـوو، كـەچی لەگـەڵ ئەوەشدا لـەماوەی صـەدان ساڵدا لەنێوان كورد و ئەرمەن یا لـەنێوان كـورد و ئاسووریدا كارەساتێكی دڵگیر ئەك كوشتارێكی وەها رووی نەدابێ؟ نەك هەر ئەوە، بەڵكو زۆر ئوســەری بێگانـــە بەتایبـــەتی سەرنجیان بۆ باشـی ی پەیوەندی ی نێوان كـورد و گـاورانی كوردستان راكێشـاوە و بەباشـترین نموونـەی رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتیان لەقەڵەم داوە. مێجارك ماسـۆن لـەوتارێكی خۆیدا كەڵـەبارەی كوردستانەوە لەسـەردەمی كۆمـەڵی جوگرافیـی

ئەڵەكیی لەلەندا خوێندوویەتەوە لـەم بارەیـەوە وتوویـە((لەوانەیـە زۆریــەمان بـیرێكی شـێواومان هەبێ كەگوایـە كـورد مەسـئوولی كوشـتارەكانی ئەرمـەنن. بـەڵام كەممان ئەوە دەزانین كـە بەشێكی یەكجار زۆری گاورەكـان لـەرۆژانی پێـش شـەڕدا (مەبەستی شـەڕی یەكـەمی جیهانـە -ك.م)زۆر بـە بەختیاری لەكوردستاندا دەژیان)). ئەو لیژنەیەش كەلەلایەن ((كۆمەڵی ئەتەوەكان)) هوە بۆلێكۆڵینـەوەی كێشەی موسڵ دانرابوو بەتایبەتی دانی بەم راستی یەدا ناوە-لەوەش زیاتر ف. كەرتێفسكی دەڵێ: قەت ((جیـاوازی ئـاینی لـەنێوان كـوردە موسـڵمان و ئەرمەنـە گاورەكـاندا ئەوڕیی ئەبینیوە)) وتەمانەت باسی ئەوەش دەكات كە چۆن هاتوچۆی ئەرمەن بۆ مزگەوت و هی كورد بۆ كڵێسە شتێكی ئاسایی ی بووە.

كەواتـە هـەر وەك زوو وتمـان هـۆی هـاندەر پـەردەی رەشـی كوێرانەی بەسەر هەستی ئاینیی ی كورددا لە هاستی ئەرمەندا هێنا بۆ ئەمەش بەڵگەی تەواو بە دەستەوە هەیە. لەزۆرناوچە بە فەرمانی میری موفتی ی و مەلا و پیاوە ئاینییەكانی تـر هەسـتی كۆمـەڵانی خـەڵكیان دەبزواند و بەئاشـكرا بۆ كوشتنی "كـافران" هانیـــان ئەدان. لـــە كوشتاری ی یەكەمدا موفتی ی پالوو خەڵكەكەی بـۆ كوشتن هان دەدا و داوای لێ دەكردن جارێكا خۆیان بە تالآنی یـــەوە خـــەریك نەكـــەن. كاربەدەســـتانی شـــاری ئـەرزرۆمیش بە ئاشكرا هاواریان دەكـرد "گـاور بكـوژن. لـەهیچ مەترسن"(!!)، "مـردن بۆگـاوران- ژیـان بۆموسـڵمانان"-ئەمـەبوو دروشمـی مـەلا و دەروێشـانی سێواس وئورفە لە ئەرەبكیر وایان بردبووە مێشكی خەڵكی ساكارەوە گوایـە كوشتنی ئەرمـەن "ئـەركی سەرشـــانی رۆڵـــەكانی محەمەدە"(!!). هەر ئـەو هاندانەش وای لە زۆر كەس كردبوو كوێرانە بكەونە گیانی پیاوە ئاینییەكانی ئەرمەن و كڵێسە دێرینەكانیش.

زۆر كـوردی سـاكار كوشـتاری ئەرمەنیان بە "غەزا" دادەنا و هەر لەبەر ئەوەش هەركامێكیان دەبووە موسـڵمان ئـەمان دەسـتیان لێ هـەڵدەگرت. بـەم جـۆرە هەسـتی كوێرانـەی ئووســتووری رەش و رووتی كورد بە زۆر وبە ئەنقەست و بە پێی پیلانێكی ئاشكرا خەبەر كرایەوە، ئوباڵی ئەمـەش بـەر لـە هـەموو لایـەنێكی تردەكەوێتـە ئەستۆی ئەوانەی ئەمەیان مەبەست بوو.

لێرەدا پێویستە بـە تایبـەتی سەرنجیش بـۆ ئـەوە رابكێشین كە زۆربـەی ئـەو كوردانـەی لـە كوشـتارەكانی ئەرمـەندا بەشـدار بوون لە سوارەی حەمیدی ی بوون كە خۆی هەر لە بنەڕەتدا بۆ

جێبەجێ كردنی كـاری وا و بـۆ خەریك كردنی كورد دامەزرێنرابوو. بۆنموونـە زۆربـەی كوشـتارەكانی دیاربەكر لە جاری یەكەمدا كرداری دەسـتی ئـەو سـوارانە بـوو كـە بەتایبەتی بۆ ئەو مەبەستە هێنرانە ناو شارەوە. لەكوشتاری دووەمدا كاربەدەستان بـە ئاشـكرا ولەبـەر چاوی ئەرمەنەكان خۆیان هانی ئەو سـوارانەیان دەدا بكەونـە گیـانی ئەرمەنـەكانی ئـەرزرۆم. دیـارە بەرهەمی ئەم جۆرە هاندانانە كەم نەبوو. بەڵام پێویستە بەشداری ی سوارەی حەمیدی ی وەك دەزگایەكی تیری سەیربكری، وەك بەشداری ی لەشكرو جاندرمەكان لە قەڵەم بدری نەك وەك بەشداری ی كـورد، ئەگـەر چی كۆنەپەرستی ی و دواكەوتوویی ژمارەیەك دەرەبەگیش دەوری خۆی لەمـەدا دەبینـی. شـایەنی باسـە سـەردارانی سـوارەی حـەمیدی ی و ژمارەیـەك ئاغـاو دەرەبـەگی تـر كوشـتارەكانی ئەرمـەنیان بەهـەل دەزانـی ی بـۆ پڕكردنـی گیرفـانی خۆیان و زەوتكردنـی زەوی وزاری ئـەوی بەوێنـە خـاوەنی گوندی سەكرت لەپالو ئیبراهیم بەگ ناوێك بە بیانوی رزگاركردنەوە ژمارەیەكی زور ئەرمەنی لای خۆی شاردۆتەوە دوای ئـەوەی كـەل و پـەل و مـــەروماڵاتی لـــێزەوتكردوون ئینجابەری داونەتە دەشت و دەرێك زور ناوچەی تر ئاغاكان دەستیان بەسـەر زەوی ئەرمەنـە كـوژراوو راكردووەكاندا دەگـرت و میریش زیاتر بۆ ئەمەی هانی ئەدان و جاری واش بـوە یـاریدەی داون ئینجـا بابلێینە سەر باسێكی زۆر گرنگ. باسی بزووتنەوەی نەتەوەیی كورد و ئەرمـەن كـە ئەبوو لـە زرووفـی دەولـەتی عوسمـانییدا ببێتـە هـۆی یەكیـەتیی و نزیـك كەوتنـەوەی هەردوو گەل نەك دوور كەوتنەوەیان لەیەك. بەداخـەوە هـەندێك هەڵـەو هۆو ئارادەیـەك كورتبینیی پیـاوە سیاسی یەكانی هـەردوولاو دەست تێ وەردانی كاربەدەستان كـارێكی وایـان كـرد تـۆوی دووبـەرەكی نەتەوەیی لەنێوان ئەرمەن و كوردی دراوسێدا زوو بەرێدات یـەدوژمنی هەردوولایان

لەشوێنێكی تری ئـەم بەشـەدا بـەكورتی باسـی پـەیدا بوونـی بزووتنـەوەی نەتـەوەیی ئەرمـەن و دامەزراندنی پارتی

((گنچـاك)) (1887) و پـارتی ((داشـــناق)) (1890)مـــان كـــردووە ((گنچـــاك))لەلایـــەن دەسـتەیەك قوتـابی ئەرمەنـەوە لەجنێف دامـەزرێنراو هـەر بەناوی خۆیـــەوە ئۆرگـــانێكی تایبـــەتی دەركـــرد. ((گنچـــاك)) حـــیزبی بۆرجوازی یە بچوكەكانی ئەرمینیا بـوو كـەئازادیی و یەكیـەتیی ئەرمینیاو دامەزراندنی دەوڵـەتی سـەربەخۆی لەرێگـەی خـەباتی

چەکدارانەوە کردبووە دروشمی سەرەکیی خۆی

(( داشناق))ی ناوداریش حیزبێکی بۆرجوازیی نەتەوەیی بوو کەبۆ ڕزگاریی ئەرمەن لەدەست زوڵم و زۆری دەوڵەتیی عوسمانیی هەوڵی دەداو دەیویست لەڕێگەی خەباتی چەکدارانەوە ئۆتۆنۆمیی بۆ ئەرمینیا لە

چوارچێوەی ئەو دەوڵەتەدا مسۆگەر بکاو لەو باوەڕەدا بوو کەلی ئەرمەن دەتوانێ لەڕێگەی یارمەتیی دەوڵەتە ئەورووپاییە گەورەکانەوە بەم مەبەستەی بگات.

بەڵام نە (گنچاک) (هەرچەندە خۆشی بەحیزبێکی مارکسیی دادەنا) و نە (داشناق) نەیانتوانی ڕاست پەیوەندیی و بەرژەوەندیی نێوان گەلە دراوسێکانی ناوچەکە و بەتایبەتی پەیوەندیی نێوان کورد وئەرمەن، هەڵسەنگێنن و کارێکی وابکەن هەست و خەباتیان یەک بخەن. م.س. لازەرێف لەم بارەیەوە دەڵێت:(لەو ڕۆژانەدا (مەبەستی ڕۆژانی کوشتارەکانی ئەرمەنە ـ ك.م ) داشناقەکان خزمەتێکی خراپیان پێشکەشی گەلی ئەرمەن کرد بەوەی پاڵیان پێوە دەنا بۆ ڕاپەڕینی ناوەخت وبەوەی ئاگری ڕقی ئەرمەنیان دژی هەموو کورد و هەموو تورك خۆش دەکرد"

سەرەڕای ئەوە چ "گنچاك" و "داشناق" و چ پیاوە سیاسی و ڕووناکبیرەکانی ئەرمەن بەر لەدروست بوون و دوای دروست بوونی ئەودوو حیزبە کەباسی "ئەرمینیای گەورە" یا ئۆتۆنۆمی و سەربەخۆی ئەرمینیایان دەکرد مەبەستیان هەموو ئەوناوچانە بووکە ڕۆژێ لە ڕۆژانی زوو زۆرینەی دانیشتوانیان ئەرمەن بوون یالەژێردەستی ئەو دەوڵەتانەدا بوون کەئەرمەنەکان کاتی خۆی دایانمەزراندبوون

هەر بۆ وێنە شاری دیاربەکر و ئەورووبەری یەلای ئەوانەوە ناوجەرگەی ئەرمینیایە ئەم جۆرەبیرە لە چاپەمەنی و ئەدەب و خەباتی ڕۆژانەی ئەرمەندا زۆر زەق و بەجۆرێکی سەرنج ڕاکێشەر ڕەنگی دابووە.

بێگومان ئەمە مەترسییەکی زەوای خستبووە ناو دڵی کوردەوە بەتایبەتی چونکە هەستیشیان دەکرد چۆن دەوڵەتە گەورەکان هەرچۆنێك بێت پشتی ئەرمەنە هاو ئایینەکانیان دەگرن بۆگەیشتن بەئامانجەکانیان یابەلای کەمەوە بۆ ڕزگارکردنیان لەدەست زوڵم و زۆری عوسمانیی. ئەگەر ئەم مەسەلەیە بخەینە قالبێکی ترەوە وا دەردەچێ: ڕووناکبیری کورد لە بچووك کردنەوەی خاکی نیشتمانی دەترسا. وەرزێری کورد لەترسی دەرپاندنی زەوی و زاری نیگەران بوو، ئاغا و

دەرەبەگیش دەسەڵاتی خۆیان لامەبەست بوو.

دیارە هەر ئەمەشە وای لە شاعیرێکی ڕووناکبیر و دوورببینی وەك حاجیی قادری کۆیی کردووە بەر لە کوشتاری یەکەم بە چەند ساڵێك بە گەرمی هاوار بکات:

خاکی جزیر و بۆتان، یانی وڵاتی کوردان

صەد حەیف و صەد مخابن دەیکەن بە ئەرمەنستان هەر ئەو جۆرە دروشمانە و ڕێبازی خەبات و تاکتیك و ستراتیجی هێز وپیاوە



سیاسییەکانی ئەرمەن دیسان وایان لە حاجی کردووە بڵێ:

هیچ غیرەتێك نەماوە صەد جار قەسەم بە قورئان

پەیدا بێ ئەرمەنستان، ناهێڵێ یەك لەکوردان وەك وتمان ئەوەی زیاتر ئەم مەترسییەی لەبەر چاوی کورد گەورە کردبوو ئەوە بوو کە دەوڵەتە ئەورووپاییەکان بایەخیان بە مەسەلەی ئەرمەن دابوو، ڕاستە زۆربەی ئەو بایەخ پێدانە ـ وەك دوایی باسی دەکەین ـ لە بەرژەوەندیی تایبەتیی دەوڵەتە گەورەکان خۆیانەوە هەڵقوڵابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەك هەر دەسەڵاتدارانی دەوڵەت بەڵکو کوردیشی ترساندبوو کە لەناویاندا وابار بوو گوایە بەیارمەتیی ڕووسیا و بەریتانیا و فەرەنسە دەوڵەت بۆ ئەرمەن دادەمەزرێ و کوردیش دەکەوێتە ژێر دەستی ئەو دەوڵەتەوە. ڕاستەکەشی بەشێکی زۆر لە ئەرمەن و بە تایبەتی داشناقەکان بەتەمای ئەوە بوون و لە زرووفی زوڵم و زۆری تەتەرەیی و ئایینیی عوسمانیکاندا کۆڵێك دڵیان پێی خۆش بوو. هەر لەبەر ئەوەش بوو ڕووناکبیران و پیاوانی ئایینی ئەرمەن و هێزە سیاسییەکانیان زۆر زوو پەنایان دەبردە بەر دەوڵەتە گەورەکان. ئەمانیش ـ زیاتر لەبەر نیازی خۆیان ـ کەم بە دەنگیانەوە نەدەهاتن. ئەمەش بۆ خۆی تارادەیەك کوردی تۆقاند بوو بەتایبەتی چونکە هەندێ جار

دەست تێ وەردانی دەوڵەتە گەورەکان لە مەسەلەی ئەرمەندا ژیان و ئاشتی ئەوانیشی دەگرتەوە. هەر بۆ نموونە چەند جارێك بەر لە کوشتاری یەکەم باڵیۆزانی دەوڵەتە گەورەکان لە بارەی باری ژیانی ئەرمەنەوە فەرمانبەرانی دەوڵەتی عوسمانییان بینیوە و لە ئەنجامدا میری پەیمانی داوە چەند هەنگاوێك بە نیسبەت ئەرمەن و ئەرمینیاوە بنێ کە هەندێکیان پەیوەندییان تەنها بە کورد و کوردستانەوە بووە ، وەك ئەوەی کە بڕیار دراوە دەست

دەرەوە بێت. کاتێك لە ساڵی 1913 دابە ناوچەکانی ئاسیای بچووکدا دەگەڕان خەڵکەکە سەیری مێنی گەڕیدەی ڕووسیان وەك نوێنەرێك دەکرد کە بۆ لێکۆڵینەوە لە باری ناوخۆی (ئەو ناوچەیە ـ ك.م ) نێردرابێ)) و هەر لەبەر ئەوەش ئەرمەنەکان بەگەرمیی پێشوازییان لێ کردووە و بۆ زۆر شوێنیان بردووە کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی دەستێکی باڵایان هەبوو لەبڵاو کردنەوەی مەترسیی لەناو کورد، و لەتێکدانی پەیوەندییان لەگەڵ ئەرمەندا. لەبەر ئەوەی لەبەرژەوەندی خۆیان بوو، لەهەزار ویەك ڕێگەوە ئاگری ناکۆکیی و دووبەرەکییان لەنێوان کورد و ئەرمەندا خۆش دەکردو هەرکوێك بای نزیك کەوتنەوەی ئەم دوو گەلەی لێ بهاتایە خێرا دەیان گرت چونکە لەزۆرشت زیاتر لەو جۆرە نزیك کەوتنەوەیە دەترسان، بە تایبەتی لەبەر ئەوەی دەیانزانی پیاوانی دووربین و هەست دیموکراسیی هەردوو گەل هەرچەندە کەمن بەڵام ڕاست بایەخی ئەوجۆرە نزیك کەوتنەوەیە دەنرخێنن. وەك دەگێڕنەوە هەر زوو شێخ عوبەیدوڵلای نەهریی سەرداری ڕاپەڕینی ساڵی 1880 گوێی نەداوەتە هاندانی میریی کەویستوویەتی لەڕێگەی ئەوەوە کوشتاری گاورەکانی ناوچەی ورمێ ڕێك بخات. وەك دکتۆر ا. ئەستار جیانیش نووسیویە سەرۆکی ((داشناق)) لەناوەندی ساڵەکانی ئەوەتی سەدەی ڕابووردوودا عەبدوڕڕەحمان بەدرخانی لە جنێڤ دیبووەو گفتوگۆی لەبارەی یەکخستنی کورد و ئەرمەنەوە لەگەڵ کردووە وگوایە عەبدوڕڕەحمان بەدرخان نووسینی تایبەتیی بەکوردیی و بەپیتی عەرەبیی لە((ترۆشاك)) (ئاڵا)ی ئۆرگانی داشناقەکاندا بڵاوکردۆتەوە. دوای ئەوە چەند جارێکی تریش ـ وەك دوایی باسیی دەکەین ـ هەوڵ بۆنزیك خستنەوەی کوردو ئەرمەن دراوە.

دیارە کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانیی بۆ ئەوەی ئەو تۆوە گرنگە بەر نەدات چالاکانە کەوتنە ناوەوەی ناکۆکیی و دووبەرەکیی لەنێوان کوردو ئەرمەنداو بەهەرچوار لاشدا ئاگری ئەو ناکۆکی یەیان خۆش دەکرد. لەهەمان کاتدا کاربەدەستان لەوەش زۆر دەسڵەمینەوە کە خەباتی سەخت و ڕەوای ئەرمەن کوردیش زیاتر هان بدات بۆ خەبات لە پێناوی مافەکانی خۆیدا. ئەمەش وەك ڕاستییەکی مێژوویی بۆ خۆی لەئارادابوو، حاجیی قادری کۆیی لەگەڵ ئەو هەموو مەترسییەیدا کەلەو شیعرانەی دا باسی کردوون و کوردیان پێ وریا دەکاتەوە: لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەوێدا

بەسەر ماتوچۆی هۆزە کۆچەرە کوردەکاندا بگیرێ و ئەفسەرێ بۆ ڕێگادانی تایبەتی سوارەی حەمیدیی چەك هەڵگرن و وەك خەڵکی تر بدرێن بەدادگەکانی میریی. ئەم جۆرە باس و خواسە تا ڕادەیەك زوو بە ناو خەڵکدا بڵاو دەبوونەوە و لەگەڵ ئەوەشدا زووربەیان جێبەجێ نەدەکران بەڵام هەر مەترسییان دەخستە دڵەوە، بەتایبەتی مەسەلەیەکی گرنگی وەك هاتوچۆی هۆزە کۆچەرەکان کە بەڕاستی مەسەلەی ژیان و مردن بوو بۆیان. دیارە هەر ئەوەش دیسان وای لە یەکێکی ئاگاداری وەك حاجیی قادری کۆییی کردووە بە پەرۆشەوە بڵێ: وا ڕێگەتان دەبەستری عێلاتی جاف و بلباس گەر مردوون لە گەرمان مەنووعە بچنە کوێستان.

پشت بەستنی ئەرمەن بە دەوڵەتە گەورەکان لەئەنجامی کورتبینیی عوسمانیکاندا تادەهات ڕووی لە زیادی دەکرد و هەر بەو جۆرەش زیاتر ترسی دەخستە دڵی کاربەدەستان و تا ڕادەیەك کوردیشەوە.

گەر دلیفسکی بەر لە دەست پێ کردنی شەڕی یەکەم و دوا کوشتاری ئەرمەن بە ماوەیەکی کەم باسی ئەوە دەکات چۆن ((سیاسەتی شۆڤێنی تورکە لاوەکان زۆری نەخایاند ئەرمەنی توشی نائومێدی کرد. وایان لێ هات هیوایان تەنها بەدەست تێ وەردانی

ڕاستی‌یەکی گرنگ دەبینی و حەز ئەکات ببێتە نموونە بۆ کوردیش.

هەم حەقیانە ئەرمەن غیرەتکێشن یەک و دوو وەک ئێمە نین لەگەڵ یەک دەعوایکەن بەشێران.

بەم جۆرە بیرکردنەوەیە زۆر باکەم لە ئارادا بوو بۆیە پاڵی بەکاربەدەستانەوە دەنا زیاتر هەوڵ بدەن ناوی ئەرمەن لەبەر چاوی کورد ڕەش بکەن، بزووتنەوەی نەتەوەیی ڕەوایان بزرێنن نەبادا ببێتە نموونە بۆ کوردیش سەرەڕای ئەوە عوسمانیێکان دەیانزانی دەتوانن بەو جۆرە بەتێرێشا دوو نیشان بشکێنن، جگە لەلێدانی ئەرمەن بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی کوردیش بەڕێگەیەکی هەڵەدا بەرن و بەوجۆرە لاوازی بکەن. لێرەدا بەڵگەیەکی مێژوویی گرنگ دەهێنینەوە کەزۆر شتی لەم بارەیەوە ڕوون کردۆتەوە. ئادامۆڤی کۆنسوڵی گشتیی ڕووسیا لە ئەرزڕۆم لەنامەیەکی ڕەسمی نهێنییدا لەبارەی ئەرمەنەوە کە بۆ باڵیۆزی ڕووسیای لە ئەستەنبوڵ ناردووە لەزمان گەورەیەکی ئەرمەنەکانەوە باسی پەیوەندی نێوان کوردو ئەرمەنی کردووە. ئادامۆڤ نووسیویە و دەڵێت: (بەتریارکم بۆ بەرچایی بانگ کردە لای خۆم و هەوڵم دا باس بێنمە سەر پەیوەندی نێوان کورد و ئەرمەن. بیری بەڕێزیان بەم جۆرە بور. ئەگەر لەناو هۆزە کوردەکاندا بەتایبەتی بەویلایەتی بەتلیس هەروا هەبن بحوژمێنی ئەرمەن دابنرێن، ئەوا ئەوانی تر بەچاوی هاوڕێی سەیری ئەرمەن دەکەن و ئامادەن دەست بخەنە ناو دەستیانەوە. حکومەتی تورکیا کەلە دەمێکەوە بەچاوی گومانەوە دەڕوانێتە هاوڕێیەتی ئەرمەن و کورد و کەبەردەوام هەوڵی داوە دژی یەک هانیان بدات، ئێستالەبەر ئەوەی بزووتنەوە لەناو کوردا کەوتۆتە ڕوو هەوڵێکی تایبەتیی دەدا بۆ ئەوەی تۆکێ تیژی ئەو بزووتنەوەیە ئاراستەی ئەرمەن بکات).

بەم جۆرە کورتبینیی بزووتنەوەی نەتەوەیی ئەرمەن و کورد و دەست تێوەردانی دەوڵەتە گەورەکان و هەوڵ و کۆششی میریی بۆ تێکدانی پەیوەندی نێوان کورد و ئەرمەن و هەوڵدانی بۆ خەریک کردن و چەواشەکردنی کورد، دەوری خۆیان بینی لەبزواندنی بەشێک لەمیللەتی کورد دژی ئەرمەن. دیارە دیسان لەمەشدا تۆتاڵی گەورە دەکەوێتە سەر ئەو لایەنەی بێ وچان تۆوی دووبەرەکیی دەچاند. هەموو هەڵسانگاندن و نرخاندنێکی قوڵ بۆ دەوری کورد لەکوشتارەکانی ئەرمەندا دەبێ و پێویستە ئەم ڕاستیە مێژووییە گرنگەش ڕەچاو بکات.

بەم جۆرە هەموو کوشتارەکانی ئەرمەن بێ جیاوازیی زۆر لەوە قوڵتر بوون کەبەئەنجامی هەستی کوێرانە و دواکەوتوویی کورد لەقەڵەم بدرێن. مەسەلەکە بریتی بوو لەکارێکی ڕێکخراوی ورد کەزۆر لایەن دەستیان تێیدا بوو. کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی توانای چارەسەر کردنی کێشەی ئەرمەنیان نەبوو، لەهەمان کاتیشدا لەدوپاتدنی ئەرمەنستا یەک ناوچەکانی یەلڤان دەترسان. ئەمە بۆ خۆی هەرێنی گەورەی ئەو کوشتارانە بوو کەبەشێکی کەم لەمیللەتی کورد بووە یەکێک لە دارەدەستەکانی جێبەجێ کردنیان.

تەنانەت لەبارەی قۆناغی یەکەمی ئەم کوشتارانەوە کە سوڵتان عەبدولحەمید و پیاوەکانی هەوڵێکی زۆریان دا بۆئەوەی گوناهی بخەنە ئەستۆی گەلی کورد، گەلێک بەڵگەی مێژوویی هەیە نیشانی دەدەن چۆن میری و تەنها میری ڕێکخەری یەکەم و تاوانباری هەرە گەورە بووە، لەزۆربەی ناوچەکاندا لەشکرو جاندرمەکانی میری کوشتاریان دەست پێ دەکرد و دەیانبراندەوە. بە وێنە شەڕێکی لەناو بردنی ئەرمەن لە ئورفە بە 3 هەزار سەرباز و لە ئەرەبکیر بە 1600 سەرباز و جاندرمە سپێردرا.

لە کوشتارەکانی شەڕی یەکەمدا ئەم ڕاستی‌یە گەلێک لەوەش ڕوونتر بوو. ئەمەش لەوەوە هاتبوو کە لەو ساڵانەدا دەستی هەموو لایەک کەوتبووە ڕوو و دەوڵەتی عوسمانیی کە بە ئەمای سەرکەوتن بوو حیسابێکی ئەوتۆی بۆ ڕای گشتیی ئەورووپایی نەدەکرد. ڕاستە بەشێک لە کاربەدەستان لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی شاردنەوەی تاوانەکانی میرییان دەدا بەڵام زۆربەیان بە ئاشکرا شانازی‌یان پێوە دەکرد. جگە لەوە گەلێک بەڵگەی ڕەسمیی گرنگ (نهێنی و ئاشکرا) بە دەستەوەیە لە هەموو ڕوویەکەوە تاوان و بەرپرسیی میری نیشان دەدەن. جایا لێرەدا کەمێکیش لەم باسانە بکۆڵینەوە تا لە ئەنجامدا باشتر بتوانین دەوری کورد دیار کەین.

بەر لە هەموو شتێک با ناوەڕۆکی بروسکەیەکی طەلعەت پاشای وەزیری ناوخۆ بهێنینەوە کە بە تایبەتی ناردوویە بۆ حاکمی حەلەب. طەلعەت پاشا لەو بروسکەیەیدا بێ و پەنا دەڵێ:

(بەر لە ئێستا پێتان ڕاگەیێنراوە کەوا بە پێی فەرمانی جەمعیەت بڕیار دراوە بە یەکجاریی ئەو ئەرمەنانەی لە ناو ببرێن کە لە تورکیادا دەژین ئەوانەی دژی ئەم بڕیارە دەوەستن (مەبەستی لە کاربەدەستانە_ك.م.) ناتوانن لەسەر کارەکانی خۆیان بمێننەوە. هەر چەند ئەو هەنگاوانەی دەنرێن توند و تیژبن دەبێت کۆتایی بۆ ئەرمەن دابنرێت. بە هیچ جۆرێک گوێ نەدەنە تەمەن و پیاو و ئافرەت و ویژدان) (!!!).

طەلعەت پاشا دەیزانی چیی مەبەستە و ئەوی دەشیگوت دەیکرد. وا لێرەدا وێنەی دوو بروسکەی تری دەهێنینەوە کە هەر بۆ حاکمی حەلەبی ناردوون:

((زانیومانە کەوا ژمارەیەك لە فەرمانبەران دراون بە دادگەی سەربازیی بە تاوانی ئالان و توند و تیژی لەگەڵ میللەتە ئاسراوەکەدا (دیارە مەبەستی ئەرمەنە_ك.م). ئەمە تەنانەت گەر بۆ ڕواڵەتیش بێت لەوانەیە ببێتە هۆی سارد کردنەوەی فەرمانبەرەکانی تر. لەبەر ئەوە فەرمان دەدەم ڕێگەی ئەو جۆرە موحاکەمات نەدرێ)).

لە بروسکەی دووەمیدا دەڵێت:

(ئەگەر گوێ بدرێتە ئەو سکالایانەی ئەو کەسانە (مەبەستی ئەرمەنە_ك.م.) لە بارەی مەینەجۆر کاری تایبەتیی خۆیانەوە دەیدەن ئەوا ئەك هەر ناردنیان بۆ بیابان دوادەکەوێ بەڵکو لەوانەشە ببێتە هۆی دروست بوونی زنجیرەیەك کرداری ئەو تۆ کە دوور نی‌یە لە دوا ڕۆژدا ببێتە هۆی پەیدا بوونی کۆسپی سیاسی. ئەبێ لەبەر ڕۆشنایی ئەمەدا فەرمانی پێویست بە فەرمانبەران بدرێت)).

شایانی باسە مەولان زادە ڕەفعەت کە یەکێك بووە لە گەورەکانی تورکە لاوەکان لە هەندێك لە یادداشتەکانی خۆیدا کە ساڵی 1929 لە حەلەب بە زمانی تورکیی چاپی کردوون دانیی بەم ڕاستی‌یانەدا ناوە، باسی ئەوەی کردووە چۆن دوای کۆبوونەوە و لێکۆڵینەوەی تایبەتی لە لایەن سەردارانی تورکە لاوەکانەوە بڕیاری لە ناو بردنی ئەرمەن دراوە.

تا لەم قۆزینەوە دەبێ سەیری کارەساتەکانی ئەرمەن لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمدا بکرێ. تیاڵ و فەرمانی میری ڕوون و ئاشکرا بوو، بەپێی ئەو فەرمانەی کاربەدەستان و لەشکری ئەوی ((پێویست)) بوو دەیانکرد. دیارە بێ بەشداریی سەرەکیی تۆپ و جبەخانەی لەشکر ملیۆن و نیوێ لە بەشەر هەروا بەئاسانی نەدەهاتنە کوشتن. هەر بۆ نموونە ئەمە دێڵینەوە، لە سەرەتای مانگی تەمووزی ساڵی 1951دا 20 هەزار سەربازی پڕ چەك بە 11 تۆپەوە لە ئەستەنبوڵەوە بەرەو شاری مووش کەوتنە ڕێ. ڕۆژی 10ی هەر ئەو مانگە ئەو تۆپانە بۆ ماوەی چەند سەعاتێك بێ وچان گەرەك و ناوچەی ئەرمەنەکانیان لەو شارەدا بۆمباران کرد. هەندێك لە کاربەدەستان، وەك موتەسەریفی مووش، بە ئاشکرا و بێ پێچ و پەنا شانازی‌یان بەوەوە دەکرد کە چەند بە ڕەقی و توند و تیژی و بێ هیچ بەزەییەك لە کوشتارەکاندا بەشدار بوون.

دیسان ئەگەر هەر لەم قۆزینەوە سەیری مەسەلەکە بکەین ئەوا بە ئاسانی تێ دەگەین و بروا دەکەین کە بەشێك لە کوردە بەشدارەکانی ئەو کوشتارانە بە زۆری کاربەدەستان پاڵیان بۆ ئەو کارە پێوە نراوە. لێرەدا دەتوانین گەلێك بەڵگە و نموونە لە سەرچاوەی زۆر جیاوازەوە بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم مەسەلەیە بهێنینەوە. ڕاستە کوردی ساکار و هەژار هەبوون لەناو برسێتی ولەبەر دواکەوتوویی خۆیان حەزیان دەکرد لە تاڵانی ئەرمەندا بەشدارین، بەڵام کاربەدەستان بەوە ڕازیی نەبوون، چونکە ئەوان کوشتنیان لەو جۆرە کوردانە دەویست ئینجا تاڵان. (ئێمە فەرمانمان دانی (بەکوردەکان_ك.م.) ئەرمەن لەناو بەرن، کەچی خێراتر کەوتنە تاڵان وەك لەکوشتن)_ئەمە قسەی یەکێکە لەکاربەدەستە گەورەکانی شاری مووش لە کاتی کوشتاری یەکەمدا.

زۆر کوردی ساکار نەیانزانی کە ئەوان فەرمانی سوڵتان و میری جێ بەجێ ئەکەن و جار و بار ئەمەیان بە ئەرمەنەکان خۆیان ڕادەگەیاند، زۆر جاریش سوارەی حەمیدی یاهۆزەکانی سەربە میری بێ یارمەتی تۆپ و لەشکر هیچیان پێ نەدەکرا. لە هەمووی خراپتر ئەوە بوو کە کاربەدەستان لە زۆر ناوچە حەپسە کوردەکانیان بەر دەدا کە چەتەو پیاو کوژیشیان تێدا بوو و کوشتن و تاڵانی ئەرمەنیان بۆ دەکردنە نرخی ((ئازاد)) کردنیان. ئەم کارە بێ ڕەوشتی‌یە لە هەموو قۆناغەکانی کوشتاری ئەرمەندا ڕووی داوە. وەك مامۆستا عەبدولعەزیز یامولکی باسی دەکا لە زۆر ناوچەی تریشەوە حەپسیان دەهێنا و دوای ئەوەی جل و بەرگی کوردی‌یان پێ لەبەر دەکردن دەستە دەستە دەیانناردنە شاری وەك ئەرزەڕووم و دیاربەکر. لەکاتی کوشتاری یەکەمدا لە هەندێك ناوچەی میری سەربازیشی بە جلی کوردیەوە ئەنارد.

دوای ئەوەی حەپس و پیاو خراپ و سوارەی حەمیدی کۆدەکرانەوە ئینجا کاربەدەستان بەگەڕمی دەکەوتنە هاندانیان و یاری‌یان بەعەقڵ و هەستیان دەکرد و ئەوسا بەریان دەدانە گیانی ئەرمەن. ژمارەیەك لەو ئەرمەنانەی ئەمەیان بەچاوی خۆیان دیوە لە نامەیەکیاندا نووسیویانە دەڵێن (بۆ ئەوەی هیچ نەبێت کەمێك بیانوو بۆ کوشتارەکان بدۆزنەوە و هەر بەو ڕادەیەش خەڵکەکە زیاتر دژی ئەرمەن هان بدەن کاربەدەستان بەر وە ئەکات و دوای کوشتارەکان گەلێك تاوانیان بۆ ئەرمەنەکان دروست دەکرد و لە هەمووی زیاتر بە یاخی بوویان لە قەڵەم دەدان).

بەڵگەیەکی تری گرنگ کەکوشتاری ئەرمەن زۆر لەوە قووڵتر بوو ئەنجامی هەستی کوێرانەو دواکەوتوویی کورد بێ ئەوەیە کەوا ئەڵمانە هاوپەیمانەکانی تورک دەستیان تێکەڵی مەسەلەکە بوو. ئەڵمانەکان ئەرمەنە هاوئایینە زۆر لێکراوەکانیان لەبەر خاتری عوسمانییە زۆر دارە هاوپەیمانەکانیان خستە پشت گوێ. دیارە ئەڵمانەکان لەمەدا بەر لە هەموو شتێک بەرژەوەندیی خۆیان لێک ئەدایەوە. ئەیانزانی ئەرمەنەکان پشت بە ڕووسیا و بەریتانیای دوژمنی ئەڵمانیا زیاتر دەبەستن وەک لەوان و ئەشیانزانی هەردوو لایان لەگەڵ فەرەنسەدا ئەیانەوێ لە ڕێگەی مەسەلەی ئەرمەنەوە زیاتر دەست بخەنە کاری دەوڵەتی عوسمانییەوە کە لە ڕاستیدا ببووە نیمچە موستەعمەرەیەکی ئەڵمانیا.

بە پێی گەلێک سەرچاوە ئەڵمانەکان دەستیان لە کوشتارەکانی ساڵانی شەڕی یەکەمیی ئەرمەندا هەبووە. ((تایمس))ی لەندەنی لە هەمان ژمارەی پێشوودا کە باسمان کرد دەڵێ گوایە ژمارەیەک کۆنسوڵە ئەڵمانەکان دەستیان بووە لە هاندانی کاربەدەستە عوسمانییەکاندا دژی ئەرمەن و بەتایبەتی لەمەدا ناوی کۆنسوڵی ئەڵمانی لە حەلەب دێنێ. وادیارە ئەفسەری ئەڵمانی لە هەندێک ناوچەدا، وەک لە ئورفە، لەگەڵ ئەیی میرالایەی لەشکری عوسمانیدا بوون کە بڕیاریانە لە ئەرمەنیان داوە لە هەندێک ناوچەی تر سەربازەکان وتوویانە گوایە فەرمانی سوڵتان و ئیمپراتۆری ئەڵمانیا جێبەجێ دەکەن. ئەرمەنەکان خۆشیان لەو باوەڕەدابوون کە ئەڵمانیا بەچاوی ناحەز سەیریان دەکات و دەستی لە ڕێکخستنی کوشتارو ئاوارە کردنیاندا هەیە.

شایانی باسە لەکاتی محاکمەی تالێریاندا لەبەردەمی یەکێک لە دادگاکانی بەرلین بەبۆنەی کوشتنی طەلعەت پاشاوە (بڕوانە بەراوێزی 64 ) باسی دەوری ئەڵمانیاش لە کوشتارەکانی ئەرمەندا هاتە پێشەوە. دادگەی ناوبراو نەک هەر دانی بەوەدا نا کە تالێریان حەقی خۆی بوو طەلعەت پاشای کوشت و لەسەر ئەو ئەساسە بەرەڵای کرد بەڵکو لە هەمان کاتدا ئەو ڕاستییانەی خرانە بەر دەمی ئەو دادگەیە دەنگێکی گەورەیان لە ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمەی ئەڵمانیادا دایەوە و لە ئەنجامی ئەوەدا ئەو ڕۆژنامانە داوایان ئەکرد ڕادەی بەرپرسیی مەعنەویی ئیمپراتۆریی ئەڵمانیاش لە کوشتارەکانی ئەرمەندا دەستنیشان بکرێ.

هەر بەم بۆنەیەشەوە جێی خۆیەتی لێرەدا بە کورتی باسی هەڵوەستی ڕای گشتیی جیهان و دەوڵەتە گەورەکان بەرامبەر کوشتارەکانی ئەرمەن بکەین. تا ئێستە چەند جارێک لە جێگەی خۆیدا باسی ئەوەمان کرد چۆن ئەرمەنەکان لە ژێر سایەی زوڵم و زۆری بێ ئەندازەی عوسمانییەکاندا ناچار بوون ڕۆژبە ڕۆژ زیاتر پشت بە دەوڵەتە گەورەکان ببەستن و پەنایان بەرنە بەر.

بەڵام ئەم دەوڵەتانە بەر لەهەموو شتێک لە قوژبنی مەسڵەحەتی خۆیانەوە سەیری ئەرمەن و مەسەلەی نەتەوەیی ئەرمەنیان ئەکرد. کەی بەپێویستیان بزانیایە پشتیان دەگرت و لە سەریان هەڵدەدایێ. گەلێک جاریش خۆیان لە عاستیدا گێل دەکرد یا لەژێر فشاری ڕای گشتیدا بەناو لەسەری ئەهاتنە دەنگ.

بەم جۆرە تێ دەگەین بۆ لە کاتی کوشتارەکانی سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدا دەوڵەتە ئەوروپاییەکان بەزۆر کەوتنە جوڵە لە وڵاتێکی وەک فەرەنسەدا تەنها ژمارەیەک لە هەرە پێشکەوتخوازە ناحەزەکانی دەوڵەت دەنگی نارەزایی خۆیان دەربڕی. بەڵام لە هەمان کاتدا زۆر کەس هەوڵیان ئەدا تەفسیر بۆ وسکت بوون وهەڵوەستی هەلپەرستیی خۆیان بدۆزنەوە. باشترین وەسف بۆ ئەمە نووسەری گەورەی فەرەنسە ئەناتۆل فرانس داویەتی کەدەڵێت: ((دیارە لەبەر ئەوەی زۆربەی خەڵک ڕووی خۆیان لەم قەوماوان وەرئەچەرخێنن، زۆر کەس توانییان ئەساس بۆ گوناهبار کردنی قوربانییەکان بدۆزنەوە.)).

لەساڵەکانی شەڕیشدا کاتێک ئەورووپا و ئەمەریکا بەخەبەر هاتن کار لەکار ترازابوو، ڕاستییەکەی ئەو بەخەبەر هاتنەشیان زیاتر بۆ ئەوە بوو هێرش بەرنە سەر ئەڵمانیای دوژمنیان. ڕاستە ڕای گشتیی لە ئەمەریکاو بەتایبەتی لە ئەورووپا لەسەر ئەرمەن هەڵیان دایێ، بەڵام ئەولەسەر هەڵدانە یەکجار لەخوێنی ملیۆن و نیوێک بەشەری بێتاوان و لە ئاوارە کردنی سەدان هەزار منداڵ و پیرو پیرێژن کەمتر بوو. قەترەیەک پیاوەتی بوو لە دەریایەکی خوێندا!!.

* * *

لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕاستییانەی تا ئێستە باسمان کردن و ئەو بەراورد و لێکۆڵینەوانەی پێشکەشمان کردن دەتوانین بەدڵنیاییەوە دیسان دووبارەی بکەینەوە کەوا مەسەلەی کوشتاری ئەرمەن زۆر لەوە گەورەترو قووڵتر بوو ئەنجامی هەستی کوێرانەو دواکەوتوویی کورد بێت. مێژوونووسی بەناوبانگ ئارنۆلد تۆینبی لەم بارەیەوە قسەیەکی ڕەوای لۆرد جێمس برایسی هێناوەتەوە کەلە وتارێکی لە ئەنجومەنی لۆردانێدا کاتی خۆی پێشکەشی کردووە و تێیدا وتوویە: ((ئەمە ڕاستە کوشتارەکان ئەنجامی هەڵچوونی ڕقی موسڵمانان دژی ئەرمەنە گاورەکان نەبوو. هەمووی بە تەواوەتی لەگەڵ ئیرادەی میرییدا دەگونجا. ئەنجامی هەستی ئایینیی کوێرانە نەبوو، بەڵکو ئەنجامی هۆی سیاسیی بوو. میری دەیویست خۆی لە دەست گەلە ناموسوڵمانەکان قوتار کات چونکە یەک بابەتیی ئیمپراتۆرییەتیان دەشێواندو عونسورێکیان پێک دەهێنا کە هەمیشە ئامادەنەبوو سەربۆ زۆرداریی دانەوێنێ)).

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەتەنها بەشێک لە میللەتی کورد نەک میللەتی کورد خۆی یەکێک بوون لە داردەستەکانی جێبەجێ کردنی ئەم کارە ڕەشە. لەگەڵ ئەوەشدا کوشتارەکان دەورێکی خراپیان لە ئاڵۆز کردنی پەیوەندیی و برایەتیی کوردو ئەرمەندا بینیی و دوژمنی هەردوولایان لەمەدا قازانجی کردو تەنانەت دوای تەواو بوونی کوشتارەکانیش ئاگری ئەو دووبەرەکییەی هەر خۆش دەکرد. دەوڵەتە گەورەکانیش تا ڕادەیەکی هەست پێ کراو ئەمەیان بەدڵ بوو.

قووڵ بوونەوەی ئەم ناکۆکی و دووبەرەکییە زوو لەچەند ڕووداوێکدا ڕەنگیی دایەوە. لەهەموو ڕووداوێک زیاتر سەرچاوە ڕۆژئاواییەکان سەرنجیان بۆ کاولکاریی و کوشتاری شاری ڕەواندوز لە ساڵەکانی شەڕدا ڕاکێشاوە. ئەوەبوو کە هێزەکانی ڕووس لە سەرەتای مایسی ساڵی 1916 دا لەژێر سەرکردایەتیی جەنەراڵ چێرنەزوبەفدا بەرەو ڕەواندوز هاتن چوار فەوجی ((فیداکان))ی ئەرمەن و نەستووریان لەگەڵدا بوو. ڕۆژی 13 ی مایس ئەم هێزانە توانییان شاری ڕەواندوز بگرن. ئەرمەنە داخ لەدڵەکان ویستوویانە تۆڵە بسێنن و بە بەرچاوی ڕووسەکانەوە کەوتونەتە گیانی دانیشتوانی ڕەواندوز. بەپێی زۆر سەرچاوە لەکاتی ئەم کوشتارەدا دەوروبەری 5 هەزار پیاوو ئافرەت و منداڵی کورد بوونەتە قوربانیی و گوایە زۆربەی هەرەزۆریان بەگوللە نەکوژراون، بەڵکو فڕێ دراونەتە گەلیی ڕەواندوزەوە. لەنزیکەی دوو هەزار خانووبەرەی ناو شاریش تەنها 20 ماڵی بەسەلامەتی دەرچوون.

جگە لە ڕەواندوزیش، هەر لەکاتی کوشتارەکان خۆیاندا، زیانی کەم لەکورد نەکەوت. لەکاتی کوشتاری یەکەمدا تەنها لەیەک ناوچە نزیکەی صەد کورد لەئەنجامی بەرهەڵستیی پیاوانەی ئەرمەن لەبەرگریی خۆیان، کوژران. لەناوچەی دیار بەکرێشدا لەموسڵمانەکان بەکوژراوەوە 195 کەس کوژران، بەڵام لێرە نزیکەی حەفتایان بەدەستی خۆیان کوژران لەکاتی دابەشکردنی تالانیدا. ساڵی 1897 یش ئەرمەنە چەکدارەکان هێرشێکی گەورەیان بۆ سەر هۆزێکی کورد ڕێکخست و زیانی زۆر گەورەیان پێ گەیاند. لەکاتی کوشتاری دووەمیشدا زیانی لەوجۆر و بابەتە لەکورد کەوت.

بەر لەوەی کۆتایی بەم باسە بهێنین زۆر گرنگ و پێویستە سەیری دیوی ئەودیوی مەسەلەکە بکەین، ئەو دیوەی بەداخەوە بایەخی زۆری پێ نەدراوە هەرچەندە بێ ڕوون کردنەوەی ناتوانرێ بەتەواوەتی و بێ لایەن دەوری کورد لەکوشتارەکانی ئەرمەندا دیار بکرێ. ڕاستەو بێ شاردنەوەو پێچ و پەنا باسی ئەوەمان کرد چۆن ئەو کوشتارانە پڕن لە لاپەڕەی ڕەشی هەندێک دەستەو دایەرەی کورد، بەڵام لەهەمان کاتیشدا لاپەڕەی پرشنگداریی کەمیان بۆ کورد تیانییە.

چ لەکوشتاری یەکەم و چ لەکوشتاری دووەمدا زۆربەی هەرە زۆری کورد بێ لایەن وەستان. هۆیەکی گەورەی ئەم بێ لایەنییە لە هەڕەشەو گوڕەشەی بێ وچانی کاربەدەستانەوە هاتبوو کەبەهەر چوار لادا بڵاویان دەکردەوە چۆن توندترین سزا چاوەڕوانی ئەو کەسانە دەکات کەکەمترین یارمەتی پێشکەش بە ئەرمەنە لێ قەوماوەکان دەکەن. لە ڕۆژانی کوشتاری دووەمدا (واتە لەساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا) میری بەزۆر ناوچەدا بڵاوی دەکردەوە کە((هەرکەسێک بوێری منداڵ، ئافرەت یاکچە ئەرمەن لەماڵی خۆیدا بشارێتەوەو لای بدۆزرێتەوە ئەو کەسەبە ئەرمەنی دادەنرێ و لەپای ئەوە سەری دادەنێ)). لەگەلێک شوێن لای هەرکوردێک ئەرمەنێک بدۆزرایەتەوە خێرا جاندرمە دەهاتن و هەر ئەو کوردەیان ناچار دەکرد بە دەستی خۆی بیکوژێ.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی زۆر ناوچە نارەزایی خۆیانیان بەرامبەر بەکوشتارەکانی ئەرمەن دەردەبڕی، لەگەلێک ناوچەشی پارەی برایانەیان بۆ ئەرمەنە لێ قەوماوەکان درێژ دەکرد، بە سەدان و بە هەزارانیان لە مردن و برسیەتی ڕزگار دەکردن. ئەکادیمی گەردلێڤسکی لەم بارەیەوە نووسیویە دەڵێ:

((لە هەموو شوێنێک لەناو کوردا ئەرمەنەکان هاوڕێیان هەبوو کەلەکاتی تەنگانەدا لەدەست تورک ڕزگاریان دەکردن. ئەمە لەکاتی کوشتارەکانی ئەرمەنی کۆتایی

سەدەی نۆزدەدا وابوو. ئێستاش (واتە لەساڵەکانی شەڕی یەکەمدا- ك.م.) هەر وایە زۆر جار کوردی وایان نیشان دەدام کە ئەرمەنیان لە مردن ڕزگار کردبوو).

بەڵگە و نموونە بۆ ئەم قسەیە زۆرەو دیارە هەر ئەوەش وای لە کوردێکی وەك مامۆستا عەبدولعەزیز یاموڵکی کردووە بڵێ: ((گەر ئەرمەنی یەك لە ئەنادۆڵدا مابێت ئەوانەن کەلە شمشێری تورك ڕزگاریان بووە، لەمانەش پێ گەورە کردن سێ لە چواریان بەهۆی یاریدەی کوردەوە ڕزگار بوون)). جا بالێرەدا چەند نموونەیەك بۆ ئەم مەسەلە گرنگەش بخەینە بەرچاو.

لە کاتی کوشتاری ئورفەدا (دوا دوو ڕۆژی ساڵی 1894) نزیکەی 2.500 کەس، کەزۆربەیان منداڵ و ئافرەت بوون، پەنایان بردە بەر کلێسەی ئەرمەنەکان، بەڵام زۆری نەخایاند نەوت کرا بە کلێسەداو ئاگری تێبەردرا. لەمانە تەنها پەنجا کەسێکیان لێ ڕزگار بوو ئەویش بەهۆی یاریدەی مستەفا ئاغای ڕەجەب و حەیدەر و خەلیل ڕەجەبەوە. جگە لەوە ئەم سێ کەسە هەموو ئەرمەنەکانی گەڕەکی خۆیان و گەلێکی تریان لە مردن ڕزگار کردووە.

لە کتێبێکی ڕووسیدا کەساڵی 1897 لە مۆسکۆ بەناوی ((یاریدەی برایانە بۆ قەوماوەکانی تورکیا)) وە چاپ کراوە بەتایبەتی سەرنج بۆ چاکەی پیاوەتیی کورد لەگەڵ ئەرمەندا ڕاکێشراوە. کتێبی ناوبراو دەڵێت: ((گەلێك بەگی کورد وابووە کەزۆر ئەرمەنیان ڕزگار کردووە. مەحموود زادە بەیتوڵڵا بەگ کەبە مرۆڤایەتی و پیاوەتی ناسرابوو، هەموو ناوچەی مۆکسی لە کوشتار قوتار کرد. لەکاتی کوشتارەکەدا لە ناوچەکەی خۆی نەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی دەیزانی پیاو خراپانی کورد نەبووبی ئەو بەهەڵ دەزانن و دەکەونە گیانی ئەرمەنەکان بەپەلە لەوان گەڕایەوەو 400 کوردی ئازای کۆکردەوەو ئەو عەشیرەتە کوردانەی (مەبەست سوارەی حەمیدییەیە- ك.م.) ڕاونا کەبەرەو ناوچەی مۆکس بۆ کوشتار دەچوون. هەر ئەم بەگە، جگە لەگەلێك یاریدەی تر کەپێشکەشی ئەرمەنی کردوون، ساڵی ڕابوردوو (واتە ساڵی 1895- ك.م.) 300 لیرە یاریووری بەئەرمەنەکان دا)). لەزۆر ناوچە کوردەکان یاریدەی ئەرمەنەکانیان دەدا کە ڕابکەن و خۆیان بشارنەوە. لە شوێنی تر کار بەوەوە نەوەستا، زۆر کورد بەچەکەوە دایانە پاڵ ئەرمەنەکان و کەوتنە بەرهەڵستی پیاوەکانی میری بەنیازی دانانی ڕادەیەك بۆ کوشتاری ئەرمەن. کوردی دەرسیم لەمەدا لە هەموان پیاوانە تر هاتنە دەست. ئەوان هەر لەدەست پێکردنی کوشتارەکان چەند جارێك شان بەشانی ئەرمەن پێکەوە ڕاپەڕیون، لەکاتی هەموو قۆناغەکانی ئەو کوشتارانەشدا لەهیچ یاریدەیەکی پێویست دریغیان نەدەکردو لەبەستنی پەیوەندی لەگەڵ سەردارانی ئەرمەندا سڵیان نەدەکردەوە. تەنانەت لەئەنجامی ئەو جۆرە پەیوەندییەدا بوو نەفسەرێکی کورد بەناوی مستەفاوەطاوە لەگەڵ هێزەکانی ژێردەستیدا دژی عوسمانیکان دایە پاڵ ڕووسەکان. هەر بەو جۆرەش کوردی دەرسیم دالدەی پتر لە 5 هەزار ئەرمەنی ئاوارەیان داو لەدەست کوشتن ڕزگاریان کردن. ئەرمەنەکان خۆشیان زۆر جار دانیان بە هەڵوەستی پیاوانەو چاکەی کوردی دەرسیمدا ناوە. کوردە یەزیدیکانیش کەبۆ خۆیان کەمتریان لە ئەرمەن بەدەست زوڵم و زۆری عوسمانیکانەوە نەدیبوو بەهەستەوە پشتی ئەرمەنەکانیان گرت و بەپێی توانا یاریدەیان پێشکەش کردن. بە وێنە لەکاتی کوشتارەکانی شەڕی یەکەمدا بەصەدان ئەرمەن لە ڕێگەی دێرەزوورەوە پەنایان بردە بەر کوردە یەزیدیکان کەپیاوانە دالدەیان دان و لەگەڵ ئەو هەموو زەغتەی خرایەسەریان تەسلیمیان نەکردنەوە.

جگە لەوە لەشکری ڕووس بهاتایەتە هەر ناوچەیەکی ئەرمینیا یا کوردستان ژمارەیەکی زۆر لە پەنا بەرانی ئەرمەنیان لای کوردەکان دەبینی. لە نامەیەکی تایبەتیدا ئەرمەنەکانی گوندی خاتسۆ باسی ئەوەیان کردووە چۆن کوردەکانی هۆزی محەمەدئاغا بە چەکەوە بەرەنگاری سەربازو جاندرمەکانی تیری هاتوون و ڕێگەیان نەداون ئەرمەنەکان بگوێزنەوە. هەر لەو نامەیەدا نووسراوە (( خۆیان (واتە کوردەکانی هۆزی محەمەدئاغا- ك.م.) لەگەڵ ئەوەشدا کە بەدەست برسێتییەوە دەیاننالاند، دوا پارچە نانیان لەگەڵ ئەرمەنەکاندا دەکرد بەدوو بەشەوە و کەلوپەلی خۆیان بۆ دەفرۆشتن)).

دوای تەواو بوونی شەڕیش لەزۆر ناوچەی کوردستان پەنابەری ئەرمەن دۆزراوەتەوە. هەر دوای بەستنی هودنەی ((مۆدرۆس)) بەماوەیەکی کەم چەند نوێنەرێکی کورد چوونەتە لای ئینگلیزەکان لە حەلەب و نامەیەکی تایبەتیان بۆ بردوون لەبارەی ئەو ئەرمەنانەوە کەدالدەیان دابوون. لەو نامەیەدا دەڵێن: ((لەگوندو خێوەتەکانماندا 650 ئەرمەنیی هەن زۆربەیان ئافرەت و منداڵن. هاوڕێکانی دراوسێمان پتر لە3800 کەسیان لایە. ئێمەبۆ ماوەی چوار ساڵ ئەمانەمان ژیاندوەو حەزناکەین ئەو نانەی پێمان داون بە فیڕۆ بڕوات. هەروەها ئاگاداریشین کە 6800 ئەرمەنیی تر لەناو خێوەتی هۆزە دۆستەکانماندا هەن کە لە ڕۆژهەڵاتن و زۆر لێمانەوە دوورن، بۆیەکا پەیوەندی کردن پێیانەوە زەحمەتە)). هەر لەو نامەیەدا ئەو کوردانە ئامادەیی تەواوی خۆیان نیشان داوە بۆ هەموو جۆرە یاریدەیەکی پێویست بۆ دۆزینەوەو کۆکردنەوەی ئەرمەنە ئاوارەکان. بە صەدان ئەرمەنیی لەو جۆرە، ناوچەکانی کوردستانی عێراق و ئێرانیان کردبووە پەناگە و بەباشی ژیان و دوا ڕۆژی خۆیان تیا مسۆگەر کردبو.

شایانی باسە جگە لە کورد گەلانی تری ناوچەکە هەریەکەیان بە پێی تەووف و توانا یاریدەی ئەرمەنیان داوە لە چەند بەڵگەیەکدا لەم بارەیەوە ناوی چەندکەس هاتووە. هەروەها زۆر تورکی واش هەبوون یاریدەی برایانەی ئەرمەنەکانیان دەدا. تەنانەت کاربەدەستی واش هەڵدەکەوت کە بە ئاشکرا فەرمانەکانی میرییان لە بارەی قەڵاچۆکردنی ئەرمەنەوە جێبەجێ نەدەکرد یا فێڵیان دەدۆزیەوە بۆ ڕزگار کردنی بەشێکیان. لە هەندێك ناوچەش فەرمانبەر و هۆزی عەرەب یاریدەی هەمە جۆریان پێشکەش بە ئەرمەنە لێقەوماوەکان دەکرد. زۆر جاریش چ کورد و چ ئەوانی تر لەسەر ڕزگارکردنی ئەرمەنەکان یاریدە دانیان تووشی سزای قورسی دەهاتن: خۆیەهەر کوردێك بزانرایە کە لایەنگری نزیك کەوتنەوەو یەکگرتنی کوردو ئەرمەنە ئەوا بێسێ و دوو سەرەونگوم دەکرا و هۆز و پیاوەکانی تووشی سەرگەردانی دەهاتن. ئەم جۆرە یاریدەوهاریکارییانە جگە لەوەی لاپەڕەی پڕ شانازین دەوری دیاری خۆیشیان لە نزیك کەوتنەوەی دواڕۆژی کوردو ئەرمەندا بینی کە لەگەڵ تەواوبوونی شەڕی یەکەمی جیهاندا سەرەتای دەرکەوت، بە تایبەتی لەو ڕێك کەوتننامەیەدا کە لە نێوان بۆغوز و نۆبار پاشای نوێنەری ئەرمەن و شەریف پاشای نوێنەری کوردا لە کۆنگرەی ئاشتی مۆر کرا. نارشاك سافراستیان قسەیەکی جوان و بەجێی لەبارەی ئەم ڕێك کەوتننامەیەوە بۆ هاتووە. سافراستیان دەڵێت:

(پیاوە دیپلۆماسی و شارەزاکان و دواییش ڕۆژنامەنووسە ئەورووپاییە جیاوازەکان سەریان لەم ڕێك کەوتنەی ئەرمەن و کورد سوڕما چونکە بۆ ماوەی نیو سەدە وایان دانەناو وایان ئیددیعا دەکرد گوایە ئەم دوو گەلە دراوسێیە (دوژمنی باوە کوشتەی یەکن) و (هەرگیز پێکەوە کار ناکەن).



**بەشێك لەوتاری:**

# چمکێك لەمێژووی ڕۆژنامەنوسی کوردی

لەکتێبی تێگەیشتنی ڕاستی‌دا:

سەرەتای پەیدابونی ڕۆژنامەنوسی هەمو گەلێك مێژوی تایبەتی خۆی هەیە. ئەو مێژووە بەستراوە بەگەلێك هۆی جیاوازەوە. بۆیەکا ڕونکردنەوەی پێویستی بە ڕونکردنەوەی زۆر لایەنی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی‌یە. بە نیسبەت پەیدابونی ڕۆژنامەنوسی کوردی‌یەوە جگە لە مەرجەکانی ناوەوەی کۆمەڵ چەند هۆیەکی دەرەوە دەوری زۆریان تیا بینیوە یەکێك لەو هۆیانە بریتیە لە پەیدابونی ڕۆژنامەنوسی و پەرەسەندنی دەوری لە ژیانی ڕوناکبیری و سیاسی گەلانی دراوسێی کوردا.

زۆر بەسەر دۆزینەوەی مەکینەی چاپدا تێنەپەڕی کە ئەوروپاییەکان پیتی عەرەبیشیان دارشت. بەلام ماوەیەکی زۆری دەویست بەر لەوەی چاپخانەی نوێو پیتی عەرەبی بگەنە وڵاتە موسوڵمانەکان. ڕاستە لەکۆتایی سەدەی پازدەوە چاپو چاپەمەنی نوێ گەیشتە وڵاتی عوسمانی، بەلام نە ئەمیان و نە ئەویان بە تورکی و عەرەبی نەبوون. یەکەم دەزگای چاپ ئەو جولەکانە هێنایانە تورکیاوە کە لەدەست زۆرداری فەرمانڕەوایانی ئیسپانیا پەنایان هێنایە بەر وڵاتی عوسمانی ئەمانە سالی 1494 یەکەم چاپخانەیان لە هەموو ئیمپراتۆری عوسمانی‌دا لە ئەستەمول دامەزراند. بەلام تەنها دەوروبەری بیست سالێك ژیا دوا بەدوای ژمارەیە چاپخانەی تری ئەوەدامەزرێنرا کە هەندێکیان بەر شاری تریش کەوتن.

ئەمەرتیەکانیش زو هاتنە مەیدانی چاپو چاپەمەنی‌یەوە. سالی 1565 یەکەم چاپخانەی ئەرمەنی لە ئەستەمول کەوتە کار. سالی 1773 لە ئیچمیادزینی نزیك یەریڤان، واتە لەناو ئەرمینیا خۆیدا، چاپخانەیەکی سەربەخۆ بەپیتی تایبەتی ئەرمەنی دامەزرێنرا. زوری نەخایاند چەند کتێبێکی ئەرمەنی ئایینی و زانستی بە چاپ کراوی کەوتنە بازارەوە. دوای ئەرمەن یۆنانی‌یەکان سەرەتای سەدەی حەڤدە چاپخانەی سەربەخۆی خۆیانیان لە ئەستەمول دامەزراند.

چاپ بەزمانی گەلە موسولمانەکانی ناو دەولەتی عوسمانی زۆر لەوە دواکەوت. سیاسەتی کوێرانەی سولتانەکان و دواکەوتویی خەلك لەمەدا دەوری گەورەیان بینی. وەك دەگێڕنەوە سالی 1483 سولتان بایەزیدی دووەم فەرمانێکی بۆ قەدەغەکردنی چاپ دەرکردو خنکاندنی کردە سزای ئەوانەی لەو فەرمانەی دەردەچن و گوایە سولتان سەلیم یاوزیش سالی 1515 ئەم فەرمانەی دوبارە کردۆتەوە. هەرچەندە ئەم باسە جێی گومانەو هێشتا بە تەواوەتی ساغ نەبۆتەوە بەلام ئەوەندە هەیە بەپێی یاسا ڕیگەی چاپخانەی کەمینە ئاینی‌یەکان نەدەدرا هیچ بە زمانی تورکی یا عەرەبی چاپ بکەن. ئەوچاپخانانە خۆیشیان لەگەل بەرزبونەوەی هەستی نەتەوەیی لەناو ئەرمەن و یۆنانی‌یەکاندا یەك لەدوای یەك داخران.

کار لەوەش تێپەڕی، سولتانەکان چاپ کردنی کتێبیان بەکفر دادەنا. بە تایبەتی کتێبی ئایینی. هەندێك سەرچاوەی تورکی باسی ئەوە دەکەن چۆن سولتان محەمەدی چوارەم (1648- 1687) فەرمانی داوە هەمو ئەو قورئانانەی کابرایەکی ئەوروپایی بەچاپ کراوی لەگەل خۆی هێنابوتی‌یە ئەستەمول تورِ بدرێنە ناو دەریاوە. هەر بە فەرمانی ئەویش ئەو پێنە عەرەبی‌یانەی بەدیاری لە ڤێنیسیاوە بۆیان نارد فرێ درانەتە دەریاوە.

لەگەل ئەوەش ڕوناکبیرانی وڵاتی عوسمانی زو لە بایەخی چاپ گەیشتن. سەرەتا سەدەی حەڤدە ژمارەیەکیان ویستیان چاپخانە لەدەرەوەی وڵاتەوە بهێنن. جی‌بەجی‌کردنی ئەم ویستە لەبەر ئەو هۆیانەی باسمان کردن کارێکی ئاسان نەبو. دەبو فەرمانڕەوایان چەند جارێك تالی ژێرکەوتن لە بەرنەمی ئەوروپاییەکاندا بچێژن تا تێبگەن هۆی سەرکەوتنی ئەوان ئەنجامی پێشکەوتنیانە. ئەمە کارێکی وای کرد وردە وردە دەرگا بۆ دەمسکەوتی زانستی کافرانی ڕۆژئاوا" بکرێتەوە. بەم جۆرە ڕێگە بۆ دامەزراندنی چاپی نوێش بەزمانی گەلە موسولمانەکان خۆش بو. ڕۆژی 5ی تەموزی سالی 1727 سولتان ئەحمەدی سێیەم بەپێی فەرمانێکی تایبەتی ڕێگەی دامەزراندنی چاپخانەی‌دا بە کابرایەك کەناوی مستەفا موتەفەرریق بو بەلام مەرجی بۆ دانا کە هیچ جۆرە بەرهەمێکی ئاینی وەك قورئان و تەفسیرو حەدیس و تەو بابەتانە قەت چاپ نەکات. سەیر ئەوەیە لەم قۆناغەدا خۆشنوسەکان دژی چاپ وەستان و وەك نیشانەی ناڕەزایی بەرامبەر ڕێگەدانی دامەزراندنی چاپخانە قەلەمو دوێتەکانیان خستە دارە مەیتێکەوەو بەشاردا گێڕایان. لەگەل هەموو ئەمانەش لەکۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەوە کاری چاپەمەنی نوێ هەنگاوی باشی لەوڵاتی عوسمانی بەرەو پێشەوە ناو ئەوەش سەرەتایەکی پێویست بو بۆ پەیدابونی ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنوسی لەو وڵاتەدا.

ڕۆژنامەش وەك کتێب سەرەتا لەناو کەمینە ئاینی‌یەکانی ئیمپراتۆری عوسمانیدا پەیدا بو. ئەرمەنیەکان زۆر زو ڕۆژنامەی نەتەوەیی خۆیانیان دامەزراند. بەلام یەکەم ڕۆژنامە لەخاکی عوسمانی خۆیدا سالی 1825 لەشاری ئەزمیر بە فەرەنسی دەرچو. دوای ئەوە بەدەوروبەری حەوت سال (1832) یەکەم ڕۆژنامە بەناوی "تەقویمی وەقایع"ەوە بەزمانی تورکی چاپ کرا. ئەمە بووە سەرەتایەکی گرنگ بۆ مێژوی ڕۆژنامەنوسی گەلانی ناو دەولەتی عوسمانی. چل سالی نەخایاند کە ژمارەی ڕۆژنامەو گۆڤاری ئەم گەلانە گەیشتە 47، لەمانە 13 یان بە تورکی و ئەوانی تریان بە یۆنانی و ئەرمەنی و عەرەبی و بەلغاری و فەرەنسی و چەند زمانێکی تر بون. ڕۆژنامەی تورکی وەك "ترجمان احوال" و "تصویر افكار"و هی تر بەناو خوێندەواری کوردیشدا بلاودەبونەوە. لە ئێرانیش سالی 1851 یەکەم ڕۆژنامەنوسی ئەم وڵاتە گەیشتە پلەیەك شوێنی دیاری لەژیانی ڕۆژانەی کۆمەلدا هەبێ.

جێگەی ڕۆژنامەنوسی لە ژیانی ڕوناکبیری و تایبەت سیاسی ئەم گەلانەدا ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر دەبوون. ناحەزانی عوسمانی و قاجاری چاپەمەنی‌یان کردە چەکی کاریگەری خەباتی سیاسی ڕۆژانەیان. وەك دواییش بەدرێژی باسی دەکەین "عوسمانیانی نوێ"و دوابەدوای ئەوان تورکانی لاو ژمارەیەکی زۆر ڕۆژنامەو گۆڤاریان لەناوەوە دەرەوەی وڵات دامەزراند. شۆڕشگێڕانی ئێران سەرەتای شۆڕشی دەستوری (1905-1911) نزیکەی 150 ڕۆژنامەو گۆڤاری هەمەجۆریان دامەزراند کە هی وایان تێدا بو لەوکاتە زووەدا 5 تا 10 هەزار دانەی چاپ دەکرد. تا دەهات سەنگی ڕۆژنامەو ڕۆژنامەنوسی لەناو عەرەبو ئەرمەندا قورستر دەبو.

بێ‌گومان ئەمانە هەمو لەژیانی ڕوناکبیرو سیاسی گەلی کوردا ڕەنگیان دایەوەو بونە هۆیەکی هاندەری گرنگ بۆ خوێندەوارە دوربینەکانی کە ئەوانیش بیر لە دامەزراندنی ڕۆژنامەی تایبەتی خۆیان بکەنەوە. عەبدولڕەحیم ڕەحیمی هەکاری کە یەکێکە لە پێشڕەوانی ڕۆژنامەنوسی کوردی کاتی خۆی لەم بارەیەوە نوسیویە دەڵێ: ئێمە دەبینین چۆن "خەباتاوان (مەبەستی ئەرمەنە" ك. م.) بەشەو ڕۆژ مرۆڤ لێ حەیران دەبێ- هەر ڕۆژەی غەزەتەکەی، هەر ڕۆژێ مجموعەکی، هەر ڕۆژە کتێبەکی دەرینەخەن".

لەگەل ئەوەش کاری ڕۆژنامەنوسی لەناو کوردا زۆر درەنگتر لە گەلانی دراوسێی پەیدابو. دواکەوتویی و بەتایبەتی لاوازی دەستەی ئینتێلیجێنتسیا یەکەم هۆی ئەمە بو. هەر بۆ نمونە ڕۆژانی شۆڕشی دەستوری ئێران پیاوە سیاسی‌یەکانی کوردیش دەیانتوانی وەك ئازەری‌یەکان بی‌کۆسپ ڕۆژنامەی خۆیان دەرکەن. کەچی وادیارە کەسێکیان بیریان لەکارێکی وا پێویست نەکردۆتەوە هەرچەندە هەزاران ڕۆلەی کورد لەو شۆڕشە گەورەیەدا بەشدار بون.

بۆ پەیدابونی ڕۆژنامەنوسی کوردی دەبو خوێندەواری وەك ڕوی هەرە گرنگی ژیانی ڕوناکبیری و دروست بون و پەرەسەندنی دەستەی ئینتێلیجێنسیا وەك دیاردەیەکی زۆر گرنگی ژیانی کۆمەلایەتی بگەنە ڕادەیەکی ئەوتۆ ئەبونی چاپەمەنی نەتەوەیی لە گەلی نەگونجێ. ئەم دو ئال و گۆڕە پێکەوە بەستراوە لەناو کوردا هێواشتر ڕویان دەدا وەك لەناو زوربەی گەلانی دراوسێی ئەودا. بەلام لەگەل ئەوەش هەردوکیان لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە بونە ڕوداوێکی هەست پێ کراو، بەرادەیەك بایەخدان بە خوێندەواری بووە یەکێك لە دروشمەکانی بزوتنەوەی ئازادیخوازی کورد. لێرەدا پێویستە سەرنج بۆ ئەوەش




ڕاکێشین کە فێرگەی ئایینی لە کوردستان لەدێرزەمانەوە جێگەی شیاوو دیاری بووەو زاناو خوێندەواری باشی پێگەیاندووە. زوربەی ئەو زانایانە لەهەستو خزمەتی نەتەوەیی ڕاست بێبەش نەبوونو دەستی بالایان لە پێشخستنی ژیانی ڕوناکبیری گەلدا هەبوو. حاجی قادرو مەلای گەورەو دەیانی تری وەك ئەوان بەرهەمی پڕشانازی ئەو فێرگانە بون کە جگە لەباسی ئاینی بایەخی زۆریان بەئەدەبی نەتەوەییش دەدا.

سەرەڕای ئەوە لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە خوێندن لەسەر شێوازی نوێ گەیشتە کوردستانیش. بۆ نمونە بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان لە عەقرە 30 قوتابیو لەزاخۆ 40و لە عەمادیە 45و لە ڕەواندزیش ئەوەندەو لە دهۆك 50و لەکۆیە 125و لە سلێمانی لەفێرگەکانی میری دەیانخوێند. دیسان بەر لە کۆتایی سەدەی ڕابردو چەند فێرگەیەکی ڕوشدیە (ناوەندی) لەناوچە کوردیەکاندا کرایەوە کە ژمارەیەکیان فێرگەی ناوەندی سەربازی بون. بەوێنە ساڵی 1893 فێرگەیەکی ڕوشدیەی سەربازی لەشاری سلێمانی کرایەوەو پاش چەند ساڵێکی کەم بەشێك لەدەرچوانی نێررانە بەغداو ئەستەموڵ. بەر لەکەوتنی عوسمانیەکان ژمارەی قوتابیانی ئەم فێرگەیە گەیشتە 110 کەس جگە لە 70 کەسی تر کە لەفێرگەی ناوەندی موڵکی دەیانخوێند.

خوێندنو خوێندەواری لەشاری گەورەی وەك دیاربەکر زۆر لەوە زیاترو خێراتر پەرەی سەند. ئاڵو گۆڕە ڕوناکبیریە گەورەکانی پایتەختو لەڕێگەی ئەوەوە پێشکەوتنی گەلانی ڕۆژئاوای ئەوروپا زیاتر کاریان کردە سەر دەستە خوێندەواری نوێی ئەو جۆرە شارانە. لەوەش گرنگتر ئەوە بو کە ژمارەیەکی زۆر لە خوێندەوارانی کورد وەك فەرمانبەر یا قوتابی دەزگای زانستیو سەربازی لە ئەستەموڵ کۆبوبونەوە. هێشتا سەدەی نۆزدە کۆتایی نەهاتبو کە لەناو ئەمانەدا هیوا هەڵکەوت بۆ خوێندن یا کاری دیپلۆماسی ڕویان کردە ئەوروپاش. دیارە ئەم ڕوداوانە چاوی خوێندەواری کوردیان کردەوەو خستیانە سەر ڕێبازێکی نوێ. هیچ لە خۆوە نیە یەکێکی وەك مستەفا پاشا یامولکی کە لە ڕیزەکانی سوپای عوسمانیدا گەیشتە بەرزترین پایەو ماوەیەکی زۆری ژیانی لە ئەستەموڵ بردە سەر.

دوای گەڕانەوەی لەکاتێکی ناسکی مێژووی گەلەکەیدا ئەو هەمو بایەخەی بەکاری ڕۆژنامەنوسیدا. یا چۆن نەوەی بەدرخان پاشاو کوڕانی جەمیل پاشا چاپەمەنیان خستبووە سەرو ئەرکەکانی خەباتی بێوچانی ڕۆژانەیان.

ئەمانە لەگەڵ پەرەسەندنی خەباتی نەتەوەییو زۆربونی فشاری زوڵمو زۆری عوسمانیو قاجاریو چەسپ بونی ڕۆژنامەنوسی وەك کارێکی کاریگەر لەناو هەمو دراوسێکانی کوردا ڕێگەیان بۆ پەیدا بونی ڕۆژنامەنوسی کوردی خۆش کرد. بەڵام بەهۆی ڕژێمی خوێناوی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمەوە دوامەرجی لەدایك بونی کۆرپەی نوێ لەناو وڵات خۆیدا نەبو. ئەمەو چەند هۆیەکی تر کە لە خوارەوە باسیان دەکەین، شاری قاهیرەیان کردە شوێنی لەبار بۆ چاپ کردنی یەکەم ڕۆژنامە لەمێژوی کوردا.

سوڵتان عەبدولحەمید کە سەرەتا خۆی بە دەستورپەروەر دادەناو لە ڕاستیدا پیاوێکی غەداری ترسنۆکو فێڵباز بو لەو ڕۆژەوەی هاتە سەر تەخت (ساڵی 1876) کەوتە گیانی هەر شتێك بۆنی ئازادیو دیموکراسیو پێشکەوتنی لێ دەهات. "فەلسەفەی" حوکمی سوڵتان عەبدولحەمید دانانی وەزیرو کاربەدەستی گەورەی نیمچە خوێندەوار بو. خۆی دەیگوت: "دەزانم ئەوڕو بەرم بەدز تەنراوە.. بەڵام من وای بەباش دەزانم ئەم پیرە دزانە لەسەر کار بهێڵمەوە.. ئەمانە بۆ من دڵسۆزن".

عەبدولحەمید هەمو قونوقوژبنێکی ئەستەموڵو شارە گەورەکانی بەپیاوی خۆی ئاخنی بو. بەپێی سەرگوزشتەی مێژونوسان لەسەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدا دەبو هەمو فەرمانبەرێکی تورك لەهەمان کاتدا پیاوی گوێ قولاغی کۆشکی یەلدز بێ. زۆر جار برا خەبەری لەبرا دەداو بەو جۆرە پاداشتێکی چەوری وەردەگرت". یەکێك لەتورکانی لاو هەر لەم بارەیەوە وتویەتی: "لە تورکیا (ی سەردەمی عەبدولحەمیدا- ك. م) تاقە ڕێگەیەك، تاقە ئامانجێك مابۆوە: کۆکردنەوەی پارەو خەرج کردنی بە

سەفاهەت. بەڵام بۆ گەیشتن بەوە دەبو ببی بە پیاوی کۆشکو دڵسۆزی خۆت بەگوێ نەدانە باوکو دایکو براو خاوڕێو بچوو ویژدانو هەموو هەستێکی نیشتمانیو مرۆڤایەتی ساغ بکەیتەوە".

دیارە دەبوو رۆژنامەنوسی لەژێر سایەی فەرمان ڕەوایی 33 ساڵەی سوڵتان عەبدولحەمید بکەوێتە زەلالەتەوە. لێرەدا چەند نموونەیەکی کەمی ماتادار دەخەینە بەرچاو هەرچەندە یەکەم "یاسای چاپەمەنی" کە ساڵی 1857 دانرابو پڕ لە مەرجو بڕیاری قەبەو گران بو بەڵام سوڵتان پێی قایل نەبو بۆیە پێنج جار (لە ساڵی 1857وە تا ساڵی 1900) ئاڵو گۆڕی تێدا کرد تا وای لێهات تەنها بۆ پێکەنین بشێ رۆژنامەنوسان مافی ئەوەیان ئەما بەهیچ کلۆجێک ناوی مەدحەت پاشاو دەستورو دینامێتو بۆمباو شۆرشو سۆشیالیزمو مافو مان گرتنو ئازادیو سەربەستیو یەکسانیو خەبات یا باسی کوشتنو لابردنی هیچ فەرمانڕەوایەک بنوسن تەنانەت ناوەی "فیل" و "فەرەج"و "قاچاغ"یش بۆ رۆژنامەنوسان نەمابو چونکە سوڵتان خۆی رەقیبی چاپەمەنیەکانی ئەستەمولو پیاوە دڵسۆزەکانی شارە گەورەکان بون. لەسەر یەک دو هەڵەی چاپ کە مانای رستەیەکی گۆڕیبو بەجۆرێک بۆنی توانجی لێ بێت رۆژنامەی "صەباح" چەند ساڵێک قەدەغە کرا. لەبەر ئەوە هیچ سەیر نی یە کۆتایی حوزەیرانی ساڵی 1894 رۆژنامەنوسانی ئەستەمول سەری دنیایان لێ هاتەوە یەک چۆن هەواڵی کوشتنی سەرۆک کۆماری فەرەنسیە س. کارنۆ بڵاو بکەنەوە. لەلایەکەوە نەدەبو توخنی باسی کوشتنی سەرۆکی دەوڵەتێک بکەون. لەلایەکی تریشەوە زاتیان نەدەکرد بنوسن بەنەردی خواو لەبەر پیری مردووە چونکە سوڵتان لەگەڵیدا هاوتەمەن بو. بەو جۆرە هیچ رۆژنامەیەک بەخۆیدا رانەپەڕمو لە دێڕێکی بچوک زیاتر بنوسن کە ئەویش برێتی بو لە راگەیاندنی هەواڵی مردنی. بە کورتی رقی ئاپەمۆزی عەبدولحەمید بەرامبەر رۆژنامەنوسی سەربەست گەیشتبووە رادەیەک تەنانەت دوای هێنانە خوارەوەشی لەسەر تەختی خەلافەت (ساڵی 1909) خۆزگەی بەوە دەخواست رۆژێ لە رۆژان بگەڕێتەوە کۆشکی یەڵدز تاوەکو "سەرتاپای رۆژنامەنوسان توڕداتە تەندورەوە".

بێگومان لەژێر سایەی رژێمی لەو بابەتە قەت چاوەڕوان نەدەکرا رێگەی بڵاوکردنەوەی رۆژنامەی کوردی بدرێ، جا یا کەس زاتی داواکردنی مافی دەرکردنی رۆژنامەیەکی بەزمانی کوردی نەدەکرد یا ئەوی بیوێرایەو لەژێر هەر پەردەیەکدا داوایەکی وای بکردایە بەدەستی بەتاڵ دەگەڕایەوە دواوە.

جگە لەوانەی باسمان کرد بۆ ئەمە هۆیەکی گرنگی تر لەئارادا بو رژێمی سوڵتان عەبدولحەمید بە توندی دژی وریابونەوەی نەتەوەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی بو. لەسەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا لە زۆر شوێن بێبەزەییانە لە بزوتنەوەی رزگاری خوازی کوردو گەلانی دراوسێی کورد درا. هەروەها سوڵتان دەیویست هۆزە چەکدارەکانی کورد بکاتە یەکێک لە دارەدەستەکانی بۆ لێدانی ناحەزانی خۆیو دەستەو دایەرەی لەبەر ئەوەش بو کە "سوارەی حەمیدی" لە چەکدارانی ئەو هۆزانە دروست کرد. دیارە سوڵتانی کورتبین شتێکی نەدەویست پێچەوانەی ئەو ئارەزووە ناهەموارەی بێ.

بەم جۆرە دەبو خوێندەواری کورد وەک خوێندەواری زۆربەی گەلانی ناو دەوڵەتی عوسمانی بۆ دەرکردنی رۆژنامەی خۆی بیر لە شوێنی تر بکاتەوە. قاهیرە لە بارترین جێگە بو بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە. بەر لە هەمو شت میسر لە زۆربەی وڵاتانی تری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست زیاتر پێوەندی لەگەڵ شارستانەتی ئەوروپا هەبو. سەرەتای پەیدابونی رۆژنامەنوسی ئەم وڵاتە دەگەڕێتەوە سەردەمی ناپلیۆنو لەشکری فەرەنسی بۆ ئەوێ، واتە کۆتایی سەدەی هەژدە. دوای داگیرکردنی میسر لەلایەن لەشکری ئینگلیزەوە (ساڵی 1882) دەسەڵاتی عوسمانی دەنگی ماو رەنگی نەما. لەگەڵ ئەوەش فەرمانڕەوایانی ئەستەمول دەیانویست کەڵک لەباری سیاسی نێوان دەوڵەتانو شاڵو گۆڕی ناو میسر وەربگرن بۆ گێڕانەوەی دەسەڵاتی لەکیس چویان. ئەمە بووە هەوێنی دوبەرەکی یەکی شاراوە لەنێوان ئینگلیزو تورکدا کە تا دەست پێ کردنی شەڕی یەکەمی جیهانی خایاند. رۆژنامەنوسی لەم دوبەرەکی یەدا دەورێکی گەورەو سەیری بینی. سوڵتان عەبدولحەمید بەهەر چوار لادا هەوڵی دەدا هەستی رۆژنامەکانی میسر بەلای خۆیدا راکێشێ. بۆ ئەم مەبەستەی پارەی زۆری دەداو هەستی ئاینیی دەبزواندو عوسمانی پەروەرانی هان دەدا تا رۆژنامەی نوێ لە قاهیرە دامەزرێنن. تەقەلای سوڵتان لەم مەیدانەدا بێ سودو ئەنجام نەبو. مێژونوسێکی عەرەب لەم بارەیەوە نوسیویە دەڵێ:

"تورکیا هەرچەند لاواز بو، بەڵام هەوڵی دەدا هەستی خەڵک دژی داگیرکەران (ی ئینگلیز- ك. م.) بزوێنێ چونکە نەیدەویست بەیەکجاری میسری لەکیس بچێ. هەمان کات زۆر میسری ئەڵقە لەگوێی تورکیا بونو ئەوەش بۆ خۆی ئەنجامی هەستی ئاینیی بو لەبەر ئەوە رۆژنامەی وا پەیدا بو کە بەلای دەوڵەتی عوسمانیدا مەیلی هەبو، هی واش هەبو بە ماندانی ئەو دامەزرا "البرهان" و "القاهرة" و (الاهرام)ی ئەوساو چەند رۆژنامەیەکی تر لەوان بون کە بەلایەنگری ئەستەمول دادەنران".

دیارە کاربەدەستانی ئینگلیز لە میسر بەرامبەر بەمە دەستەوەستان نەوەستان، بەتایبەتی چونکە سوربون لەسەر مانەوەی خۆیانو دەرپەڕاندنی یەکجاری عوسمانی یەکان لەمیسرو بۆ جێبەجێ کردنی ئەو مەبەستەش ئامادە بون بێ سێو دو پەنا بەرنە بەر هەر رێگەیەک دەست بدا. کۆششی ئینگلیز لەم مەیدانەدا لە کۆششی عوسمانی یەکان گەلێک بەرهەمدارتر بو. ئەمە بەر لە هەموشت ئەنجامی ئەوە بو کە تواناو دەسەڵاتیان زۆر لەوان زیاتر بو. رۆژنامەی وەک "الوطن" و "الزمان" و "مراة الشرق" و (النیل) و "المقطم" هی تر کەوتنە هێرش بردنە سەر دەسەڵاتی عوسمانیو نیشان دانی عەیبو عاری. دوبەرەکی یەکی توندو تیژ لەنێوان رۆژنامە ئینگلیز خوازکانو ئەوانی سەر بە ئەستەمول دروست بو.

سەرەڕای ئەوە کاربەدەستانی ئینگلیز لە میسر دەرگایان بۆ هەمو ناحەزانی سوڵتان عەبدولحەمیدو رژێمی عوسمانی خستە سەر پشت. شاری قاهیرە بووە یەکێک لە مەڵبەندە گرنگەکانی کۆبونەوەو خەباتی تورکانی لاو کە دوژمنی هەرە گەورەو بەتوانای سوڵتان بون. یەکێک لەو کارانەی تورکانی لاوی دەرەوەی وڵات بایەخی زۆریان پێ دەدا دەرکردنو بڵاوکردنەوەی رۆژنامە بو بە چەند زمانێک لەبەر ئەوە قاهیرەش بووە ناوەندێکی گرنگی خەباتیان لەم مەیدانەداو ئەو رۆژنامانەی لەوێ دەریان دەکردن بوبونە رویەکی دیاری چالاکی یان شایانی باسە یەکێک لەو رۆژنامانە کە ناوی "اجتهاد" بو دوکتور عەبدوڵلا جەودەتی کورد بڵاوی دەکردەوە کە بۆخۆی یەکێک بو لەیەکەم دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵی "تورکانی لاو".

بەهەمان دەستور کاربەدەستانی ئینگلیز ماوەیان دەدا بە ناحەزانی تری سوڵتان میسر بکەنە مەڵبەندی کارو خەباتیان. نیشتمانپەروەرانی ئەرمەن وەک نیشتمانپەروەرانی تورک لێرە بەگەرمی کەوتبونە جمو جوڵ. ئەوانیش لە قاهیرە رۆژنامەی خۆیان هەبو.

بەم جۆرەو هەر لەبەر ئەو هۆیانەی باسمان کردن، میسر بووە باشترینو نزیکترین شوێن بۆ لەدایک بونی یەکەم رۆژنامە لە مێژوی کوردا. رۆژی پێنج شەممەی 30ی "ذو القعدە"ی ساڵی 1315ی کۆچی- 9ی نیسانی ساڵی 1314ی رۆمی کە دەکاتە 22ی نیسانی ساڵی 1898ی عیسایی لەشاری قاهیرەی میسر یەکەم ژمارەی یەکەم رۆژنامەی کوردی لە چاپخانەی "الهلال" لە لایەن میقداد مەدحەت بەگی نەوەی بەدرخان پاشاوە چاپکرا.

بەم مەینەتو دەردی سەری یە بناغەی رۆژنامەنوسی کوردی دانرا کە وەک دیمان تەنها دواکەوتنی گەلێ ساڵی پێویست چونکە ژانی گەلی کورد بۆ لەدایک بونی یەکەم رۆژنامەی زۆر زیاتری لەژانی گەلانی تر خایاند. جێگەی خۆیەتی لێرەدا باسی ئەو نامەیە بکەین کە روناکبیرێکی کورد ناردویە بۆ خاوەنی "کوردستان" و تێیدا بەداخەوە پێی دەڵێ تۆ درەنگ دەستت پێ کردو دەبو بەر لە 20 ساڵ، واتە حەفتاکانی سەدەی نۆزدە، رۆژنامەکەت دەرکردایە.

وەک دوایش باسی دەکەین میقداد مەدحەتو بەتایبەتی عەبدوڕەحمان بەگی برای لە نزیکەوە پەیوەندی یان لەگەڵ تورکانی لاودا هەبو. ئەمەش بۆ خۆی ئارادەیە کاری دەرکردنی "کوردستان"ی ئاسان کرد. ئەو پەیوەندی یە نزیکەی بەدرخانی یەکان وای لەژمارەیە مێژونوس کردوە رۆژنامەی "کوردستان"یش بە یەکێک لە ئۆرگانەکانی تورکانی لاو لە قەڵەم بدەن بەڵام راستی یەکەی "کوردستان" رۆژنامەی سەربەخۆی نیشتمانپەروەرانی کورد بو کە زۆر شت لەو سەردەمەدا لەگەڵ ناحەزانی رژێمی عەبدولحەمید لە یەک سەنگەردا کۆی دەکردنەوە.

دەمێنێتە ژمارەیەکی زۆر لە کوردو رۆژهەڵاتناسان بایەخ دەدەن بە مێژوی یەکەم رۆژنامەی کوردی‌و شوێنی لەژیانی روناکبیری‌و سیاسی کوردستاندا. مینورسکی پتر لە 60 ساڵ لەمەوبەر باسی

دەرچونی "کوردستان"ی لە قاهیرە کردووە دوای ئەو بە دو ساڵ (ساڵی 1917) گەردلێفسکی بەم جۆرە هەمان باسی هێناوەتە کایەوە: "ساڵی 1898 لە قاهیرە رۆژنامەی "کوردستان" دەرچو، دوایی لە جنێڤ دەست کرایەوە بە بڵاوکردنەوەی. ئەم رۆژنامەیە کوردێک کە مەدحەتی کوڕی بەدرخانی ناودار بو دەری کرد. دیارە لە تورکیا بڵاوبونەوەی قەدەغەبو" دوابەدوای ئەمان زۆر کوردناسی تر باسی ساڵی دەرچوونی "کوردستان" یان بەدروستی کردوە، بەڕێز مرخاندویانە دوکتۆر بلەچ شێرکۆ دەربارەی "کوردستان" نوسیویە دەڵێ: ئیشتمانپەروەرانی کورد لەناو خۆیاندا بڕیاری دەرکردنی ئەم رۆژنامەیەیان داو بەو جۆرە بووە ئۆرگانی ئەوان. دکتۆر شاکیر خەصباکیش دەرچوونی "کوردستان" بەسەرەتای گۆڕین یا قۆناغێکی نوێ لەژیانی کوردا دادەنێت.

چاوگێڕانێکی خێرا بە ناودرۆکی ژمارەکانی "کوردستان"دا ئەم راستی یە ساغ دەکاتەوەو دەری دەخات چۆن رۆژنامەنوسی کورد لەسەرەتای لەدایک بونیەوە لەژێر رەبری زوڵم و زۆری عوسمانی یان و ناڵ و گۆڕی فیکری ناو دەستەی روناکبیری کوردا رێگەی خەباتی راستی بۆ خۆی هەڵبژارد. لەیەکەم ژمارەیەوە "کوردستان" وریاکردنەوەو هاندانی فێربونی صەنعەت"ی کردە دروشمی خۆی. وەک جگەرسۆزو دوربین زۆرجار باسی نرخ و بایەخی خوێندن و خوێندەواری دەکار لە رۆڵەی کورد دەپارێتەوە ئەویش وەک رۆڵەی گەلانی تر روکاتە خوێندن بە نیازی زیاتر بزواندنی هەستی کۆمەڵانی خەڵک لەم بارەوە "کوردستان" زۆ زۆ پەنا دەباتە بەر فەرمایشتەکانی پێغەمبەر "د. خ" لەرحەق پێویستی و قازانجی فێربون. "کوردستان" دەیویست بەهەموان راگەیێنی چۆن خوێندەواری بۆتە هەوێنی پێشکەوتنی گەلان. ئەوەتە بەیاریدەی خوێندن، ژاپۆن بەسەر چین و میسر بەسەر سوداندا زاڵ بون. لە عەقڵەوە دەیویست مەسەلەی ئاین و خۆشەویستی ئیشتمان تێکەڵ بەیەک کاو بەوجۆرەلاوی کورد بجوڵێنێ. دەیویست لەرێگەی قسەی پڕ بایەخی شاعیری گەورەی وەک خانی یەوە کورد بۆ "اتفاق" هاندا.

هەرکات ناوی "کوردستان" هاتە پێشەوە دەبێ دو روی پڕ شانازی ئەم رۆژنامەیە بخرێتە بەرچاو. یەکەمیان هەڵوەستی یە بەرامبەر گەلی ئەرمەن و ئەوی تریان بەرامبەر بەو دەزگا سەربازی یە دواکەوتووەی سولتان دەوروبەری کۆتایی سەدەی نۆزدە بە ناوی "سوارەی حەمید"یەوە لە پیاوی چەکداری هۆزانی کورد دایمەزراند.

وەک ئاشکرایە لە ئەوەدەکانی سەدەی رابردووەوە فەرمانڕەوا شۆڤێنی یەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەناحەق کەوتنە گیانی نەتەوەی ئەرمەن و ویستیان هۆزە چەکدارەکانی کورد بکەنە یەکێک لەداردەستە هەرە کاریگەرەکانی جێبەجێ کردنی ئەو کارە گڵاوەیان. پەردە لە رووداونی ئەو کارەو بەرهەڵستی کردنی بۆ قۆناغی خۆی ئەرکێکی ئاسان نەبو. لەو کاتەدا کە زۆرکەس کوێرانە دەستی خۆیان بەخوێنی ئەرمەن رەش دەکردو لەوانی زیاتر دەستیان بەکڵاوی خۆیانەوە دەگرت با ئەیبا "کوردستان" دڵسۆزانە بانگی ئەوەی کوردی دەکرد لە مەبەستی راستەقینەی سوڵتان عەبدولحەمید بگەن و نەبنە هۆی لەناوبردنی ئەرمەنی دراوسێی دێرینیان، بەپێچەوانەوە: "کوردستان" بەگەرمی داوای لێ دەکردن پارێزگاری برا ئەرمەنیەکانیان بکەن هیچ نەبێ لەبەر ئەوەی هەردو لایان وەک یەک گیرۆدەی زوڵم و زۆری سوڵتان عەبدولحەمیدو دەستەو دایەرەی ئەون، داوای لێ دەکردن شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری بکەنە نمونەو دەرسی لێ وەرگرن چۆن کاربەدەستانی ئەستەمول لە حەفتاکانی سەدەی نۆزدەدا نەیانتوانی دژی گاوران هانی دەن. جاری وا هەبو "کوردستان" لە دڵسۆزی یەوە بەرەقی روی دەمی دەکردە گەلی کورد تاوەکو زیاتر بیبزوێنێ و لەو کارە ناهەموارەی دورخاتەوە.

عەبدوڕڕەحمان بەدرخانی سەرنوسەری "کوردستان" راسترین هەڵوەستی بەرامبەر کوتارەکانی ئەرمەن هەبو. کار گەیشت بەوەی ئەم پیاوە دوربینە بەئاشکرا حاشای لە عوسمانی کوڕی کرد چونکە لە کوشتاری ئەرمەندا بەشدار بو.

بەهەمان چەشن "کوردستان" بە تەرپەڕی تێگەیشتنەوە "سوارەی حەمیدی"و مەبەستی شاراوەی دامەزراندنی هەڵسەنگاند. کاتێک ژمارەیەکی زۆر لە سەرەک هۆزانی کورد رەشبەڵەکیان بەبۆنەی دامەزراندنی ئەو دەزگایەوە دەگێڕاو ی وایان هەبو وای دەزانی خێرو بەرەکەت بۆ هەمو کورد دێنێ(!) "کوردستان" بەهەموانی رادەگەیاند کە مەبەستی سەرەکی "سوارەی حەمیدی" خەریک کردنی کوردو خۆشکردنی ئاگری دوبەرەکی نێوان ئەوان و ئەرمەنە تاوەکو دژی سیاسەتی چەوساندنەوەی سوڵتان یەک نەگرن. دیارە دەزگایە بۆ کاری وا ناڵەبار دامەزرابێ دەبێ لە زیان بەولاوە هیچی لێ چاوەڕوان نەکرێ. جێگەی تەقدیرو نیشانەی دوربینی یە کە "کوردستان" بەهەمان دەستور روی کردۆتە ئیشتمانپەروەرانی عەرەبو داوای لێ کردون بەقسەی سوڵتان هەڵنەخەڵەتێن و رێگە نەدەن بە دامەزراندنی "سوارەی حەمیدی" لەناو هۆزی چەکداری عەرەبدا.

زۆر روی تری "کوردستان" وەک یەکەم رۆژنامەی کوردی سەرنج رادەکێشن. "کوردستان" لەهەر رێگەیەکەوە بۆی لوابێ هەوڵی داوە هەستی کورد بەشێوەیەکی دیموکراسی یانە ببزوێنێ. لەبەر خاتری ئەم مەبەستە زۆر لاپەڕەی "کوردستان" بۆ باسی ئەدەبو مێژوی کورد تەرخان کراون و بە بەیتی پڕماناى "مەم و زین"ی خانی رازێنراونەوە.

لەبەر ئەمانەو زۆر هۆی تری وەک ئەوان دەبو "کوردستان" ئاوارەی وڵاتان و میوانی شاران بێ. راستە زۆر ئۆرگانی ئیشتمانپەروەرانی تری ناو ئیمپراتۆری عوسمانی وەک "کوردستان" دەربەدەر بون، بەڵام هیچ کامیان بەرادەی ئەو ناچار نەبون شارەو شار کەن. ژمارە یەک تا پێنجی لە قاهیرەو شەش تا نۆزەی لە جنێڤ و بیست تا بیستو سێی دیسان لە قاهیرەو تەنها بیستو چواری لە لەندەن و بیستو پێنج تا بیستو نۆی لە فۆلکستۆنی باشوری ئینگلتەرەو سی و سی یەکی جارێکی تر لە جنێڤ چاپ کراون. ئەم "گەشتە"ی "کوردستان" تەنها 47 مانگو 22 رۆژی خایاند. هەر لەبەر ئەوەشە کە لەو ماوەیەدا لە بریتی (96) تەنها (31) دانەی لێ دەرچو، واتە لە بریتی پازدە رۆژ کە بڕیار بو، هەر ژمارەیەی پتر لە 45 رۆژی بەردەکەوێ. گەلێ جار خاوەنی "کوردستان" داوای خۆش بونی لە خوێنەر کردووە چونکە نەیتوانیوە کاتی خۆی رۆژنامەکەی دەرکا.

دەرچونی کوردستان بووە گرێیەکی تر لە ناخی دڵی سوڵتان عەبدولحەمیدو دەستەو دایەرەکەیدا. ناوەڕۆکی ئەو ژمارانەی "کوردستان" کە بۆ یەکەم جار لە قاهیرە چاپ کران رون نیشانی دەدەن چۆن پیاوانی سوڵتان کەوتونە شەپ فرۆشتن و بیانوگرتن بە میقداد مەدحەت بەدرخان. کار گەیشتووە بەوەی داوایان لەکاربەدەستانی میسر کردووە وەک "تاوانبارێک" میقداد مەدحەت بدەنەوە دەست ئەستەمول، وادیارە ئەمە پاڵی نا بە بەدرخانی یەکانەوە ناچار "کوردستان" بگوێزنەوە ئەوروپا.

پەیوەندی نزیکی عەبدوڕڕەحمان بەدرخان لەگەڵ ئیشتمانپەروەرانی تورک زیاتر رقی سوڵتان عەبدولحەمیدی هەڵدەستاند. زۆر لە بیروباوەڕی کۆمەڵی "تورکانی لاو" لەناودرۆکی وتارەکانی "کوردستان"دا ئاشکرا رەنگیان داوەتەوە. عەبدوڕڕەحمان بەدرخان یەکێک بو لەبەشداراني یەکەم کۆنگرەی ئەم کۆمەڵە کە شوباتی ساڵی 1902 لە پاریس بەسترا. جگە لەوە جاروبارێش لە رۆژنامەی "عوسمانلی" ئۆرگانی ئەو کۆمەڵەدا وتاری بڵاودەکردەوە. سەرەڕای هەمو ئەمانە ژمارەکانی ئەوروپای "کوردستان" ئاشکرا لە چاپخانەکانی کۆمەڵی "تورکانی لاو" چاپ کران. لەدوا لاپەڕەی زوربەی ئەو ژمارانەی لە ئەوروپا چاپ کران ناوی ئەو چاپخانانە بە ئاشکرا تۆمار کراوە.

دیارە ئەوەندە بەس بو بۆ ئەوەی "خاکی کوردستان لە "کوردستان" قەدەغە کرێ. خاوەن و خوێنەرانی چەند جارێ باسی ئەمەیان لەسەر لاپەڕەکانی "کوردستان" خۆی کردوە. بەڵام کپ کردنی دەنگی خەباتکەری رەسەن کارێکی مەحاڵە. بەپێی ئەو یاسا چەسپاوە "کوردستان" توانی وەک یەکەم رۆژنامەی کوردی تا رادەیەکی زۆر دەوری مێژویی خۆی ببینێ. وەک لای راستی ئاوی رۆژنامەکە خۆیەوە نوسراوە خاوەنی هەرجارە دو هەزار دانەی لێ ناردۆتە کوردستان بەو نیازەی بێ پارە بەسەر خەڵکدا دابەش بکرێن. دور نی یە بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارە گرنگە بەدرخانی یەکان پەنایان بردبێتە بەر یاریدەی ئیشتمانپەروەرانی تورک و ئەرمەن، هەر چۆن بێ ئەو سەرنەمە ناردنی رۆژنامەی نەیاری سوڵتان عەبدولحەمید بۆ خەڵکی ناو وڵات کارێکی باو بو. بەرێوەبەرانی ئەو رۆژنامانە هەزارو یەک فروفێڵیان دەکرد بۆ جێبەجێ کردنی ئەو مەبەستەیان: جاری وا هەبو رۆژنامەکانی خۆیان دەخستە ناو چاپەمەنی ئەوتۆوە کە وێنەی سوڵتان یا باسی باشی ئەویان تێدا



The Bedirkhans
Kurdish Family

بو. رۆژنامەنوسانی عەرەبیش بۆ سەر لێ شێواندنی عوسمانیو ئینگلیز یا پیاوانی خدێو پەنایان دەبردە بەر ئەو جۆرە فێڵە. یەکێکیان دە جار ناوی رۆژنامەکەی خۆی گۆڕی دیارە بۆ ئەوەی نەناسرێتەوەو بەوجۆرە بگاتە ناو ولات.

گومان لەوەدا نی یە لە هەر رێگەیەکەوە بوبێ بەدرخانی یەکان "کوردستان"یان گەیاندە دەست سەرەك هۆزو روناکبیرانی کورد. لە زۆر نوسینی ناو "کوردستان"ەوە دەردەکەوێ ژمارەکانی زوبەزو دەگەیشتنە زۆر ناوچەی کوردەواریو شوێنی تری ناو دەولەتی عوسمانی. هەر زو پەیوەندی لەنێوان خاوەنی "کوردستان" و روناکبیری کوردا دروست بو.لە لاپەڕە چواری ژمارە دوی "کوردستان"دا میقداد مەدحەت بەدرخان باسی نامەی "هەندێك میرو ئاغای کورد" دەکاو دەڵێ داوایان لێ کردووە باسی "حالی تهۆر ئەدەبیاتا کوردی" بلاو بکاتەوە. لە ژمارە سێیدا نامەی کوردێکی شام بلاو کراوەتەوە کە باسی ئەوە دەکا چۆن "کوردستان"یان پێ گەیشتووەو خەلك لە خۆشیانا ماچیان کردووەو کۆتاییش گەلێك رەحمەتی بۆ میقداد مەدحەتو باوو باپیری ناردووە. دوای ئەوە بە دو ژمارە نامەی "اطلەیی سید طاهر بوطلی"ی بلاو کردۆتەوە کە خاوەنی بەرز ناوەرۆکی "کوردستان"ی ئرخاندوەو باس دەکا چۆن لە "خوێندنەوەی تێر ئەبووە"و داوا دەکا هەرجارەی "چل پەنجا" دانەی بۆ بنێرن چونکە ئەدەتە "وەك بازێری کوردی لیهاتووە"و "هەر سالەی دە پازدە هەزار" کوردی تێ دەرژێو گەلیکیان وەك دەلێ، لەوێ دەمێنێتەوە. لە ژمارەی تری "کوردستان"دا نامەی خەلکی ماردینو دیاربەکرو موسلو شوێنی تر بلاوکراونەتەوە. لەوەش گرنگتر: لەسەر لاپەرە چواری ژمارە سیازدە لیستەی ئەو پارەیە بلاوکراوەتەوە کە بەشدارانی "کوردستان" لەدیاربەکرو سلێمانیو ئەدەنەوە ناردویانە.

وا دیارە "کوردستان" لەدەرەوەش، تایبەت لەناو رۆژهەلاتناسانا، دەنگی داوەتەوە. عەبدوڕڕەحمان بەردخان لەژمارە سیازدەی "کوردستان"دا باسی ئەوە دەکا چۆن لەوەتەی دەستی کردووە بە دەرکردنی رۆژنامەکەی "گەلێك مرۆڤی ئەجنەبی ئەلەمانو ئیمچە (ئەمسایی- ك. م.) و ئینگلیز" ئیشتراکیان تێدا کردووە "علی الخصوص یەك ئەلەمان هەیە ناوی فێ مسیو (مارتن هارتمان)ە" کە زوربەی زمانی گەلانی رۆژهەلات دەزانێو تەنانەت لەگەل ئەو خەریکی فێربونی کوردیشە. هیچ دور نی یە ئەو 26 ژمارە دەگمەنەی "کوردستان" کە لە کتێبخانەی دەولەتی ماربورگی ئەلەمانیای رۆژئاوا پاریزراون هەر ئەوانە بن کە کاتی خۆی بۆ زانای بەناوبانگ هارتمان چون.

شایانی باسە ژمارەکانی یەکەم رۆژنامەی کوردی ئێستە زۆر بە دەگمەن دەست دەکەون. جگە لەو 26 ژمارەیەی کتێبخانەی دەولەتی ماربورگ کە کاتی خۆی دوکتۆر کەمال فوئاد بە ئۆفسێت بلاوی کردنەوە 18 ژمارە لەوانەی سالی 1899ر بەدواوە چاپ کراون لە کتێبخانەی ئیشتمانی ئەنقەرە پاریزراون، ژمارەیەکیشی لە کتێبخانەی لقی دەزگای رۆژهەلاتناسی سۆڤیەت لە لینینگراد هەیە. لە کتێبخانەی "کوری زانیاری کورد" ژمارە پێنج ولاپەرە سێو چواری ژمارە سێی هەن. یەکەمیان لەسەر کاغەزێکی تەنکی رەنگ سەوزو دووەمیان لەسەر کاغەزێکی زەردباو چاپ کراون. دور نی یە جگە لەمانە ژمارەی تری "کوردستان" ئەم لاو ئەولا دەست بکەوێ.

پیاوانی سولتان هەولێکی زۆریان لەگەل نەوەی بەدرخان پاشادا بۆ ئەوەی دەست لەبلاوکردنەوەی "کوردستان" هەلگرن. وەك لە پێشیشەوە باسمان کرد سولتان عەبدولحەمید ئامادە بو هەموشتێك بکا تەنها بۆ ئەوەی ناحەزانی دەرەوەی بەلای خۆیدا راکێشێ. بەوجۆرەی توانی زۆر سەردارو رۆژنامەی نەیاری خۆی بکرێ کە یەکێکیان رۆژنامەی ناوداری "مشورت" بو کە تورکانی لاو لە دەرەوەی ولات دەریان دەکرد.

تا ئێستە بۆمان ساغ نەبۆتەوە "کوردستان" چۆنو بۆ لەدەرچون وەستا. وەك رامزور باس دەکا گوایە "نوێنەرانی سولتان سالی 1904 توانیویانە (عەبدوڕڕەحمان بەدرخان- ك. م.) قایل کەن دەست لە بلاوکردنەوەی رۆژنامەکەی هەلگرێ". هەرچەندە دور نی یە وەستانی "کوردستان" ئەنجامی کارێکی وا بوبێ، بەلام لەگەل ئەوەش پێویستە چەند راستی یەك بۆ مێژو تۆمار بکەین. بەر لە هەموشت دوا ژمارەی زانراوی "کوردستان" نیسانی سالی 1902 دەرچووە نەك 1904، لەو کاتەشدا عەبدوڕڕەحمان بەدرخان لەریزی پێشەوەی ناحەزانی سولتان عەبدولحەمید بو، هەموی مانگێك بو لەیەکەم کۆنگرەی تورکانی لاو گەرابۆوە جنیف. جگە لەوە تادوا ژمارەی زانراوی "کوردستان" بە تۆسقالێ بۆنی ئەوە ناکرێ خاوەنی لەڕێبازی کوردایەتی راست وخاوێن لای دابێ. دور نی یە لەبەر کەم دەسی یالەژێر فشاری چەتەولەکانی سولتانا یا لەبەر مەبەستێکی سیاسی تر "کوردستان" لە دەرچون وەستان بێ.

ئەمەبو بەکورتی داستانی لەدایك بونو ژیانی پڕئێش وئازاری یەکەم رۆژنامەی کوردی. بڕوا ناکەم مێژونوسێکی خاوەن ویژدان هەبێ ئەم داستانە بە سەرەتایەکی پڕشنگداری پڕ ماناو بەلگە دانەنێ. هەر لەو سەرەتایەشەوە رون دیار بۆ پەرەسەندن و گەشەکردنی رۆژنامەنوسی کوردی بەستەیە بە رادەی رەسەنی سروشتی دیموکراسی ئەو رژێمانەی وا هات کورد لەژێر سایەیاندا بژی. ئەوەبو تا شۆڕشی سالی1908ی تورکیا سەرنەکەوت رۆژنامەیەکی تری کوردی چاوی هەلنەهێنا.

# شوێنی گەلی کورد لەشۆڕشی بیستدا

لەکتێبی چەند لاپەڕەیەک لەمێژووی گەلی کورد:

شۆڕشـــی ســـاڵی 1920 جێگەیەکی زۆر دیاری لەمێژووی هاوچـــەرخی عـــێراقدا هەیە بەسەرهاتەکانی ئەم شۆڕشە بـــەدوورو درێـــژی لەلایـــەن مێژوونووسـانی خۆمـان و دەرەوە باس کراون تەنها لایەنێکی گرنگی نـەبێت کـە تـاوەکو ئێستەش پێویستی بە لێکۆڵینەوەو نووسینە، ئـەویش دەوری گـەلی کـوردە لـەم شۆڕشـەدا کـە شتێکی ئـەوتۆی دەربـارە نەنووسـراوە تەنانـەت بەشێک لەمێژوونووسانی هەندەران لەو بڕوایەدان کە گوایە کورد هیچ دەورێکی لەم شۆڕشەدا نەبووە هی ئەوتۆشیان هەیە، وەک ئایرلـەندو لۆنگریـگ، بایـەخێکی ئـەوتۆیان بـەدەوری کـورد نـەداوە. ئەمـە لـەکاتێکدا ڕوون کردنـەوەو دەرخستنی دەوری کورد لەشۆڕشی بیستدا بایەخی مێژوویی تایبەتی ی خۆی هەیە، هیچ نـەبێت لەبـەر ئـەوەی ئەم شۆڕشە خۆی یەکەم بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی هاوبەشی هـەردووک گـەلی گـەورەی عـێراق عەرەب و کوردە،

دیارە ناشێت بە تاقە وتارێک بـەدرێژی و وەک پێویستە دەوری گەلی کورد لە شۆڕشی بیستدا دیار بکرێت، بۆیەکا هەوڵ دەدەین لێرەدا تەنها چەند لایەنێکی بایـەخداری ئەو دەورە بخەینە بەرچاو.

بەرلە هەر شتێک پێویستە ئەو ڕاستییە دەربخرێت کە کـوردی عێراق دەوریان گەورەبووە لەخۆش کردنی ڕێگەی بەرپابوونی شۆڕشی بیسـتدا، بەماوەیـەکی زۆر پێـش تەقینـەوەی ئەو شۆڕشـە لەگـەلێک ناوچـەی کوردسـتاندا خـەباتێکی سەختی چەکدارانە دژی ئینگلیزی داگیرکـەر دەسـتی پـێکردبوو. هەموری بەسەر یەکەوە شەش مانگ

بەسـەر هـاتنی ئینگلیزەکـاندا ئێنەپەڕی کاتێک جوتیارانی گۆیان بە چەکەوە پەلاماریان دان. هەر لەو دەروبەرەدا لەچەند ناوچەیەکی تری بادینـان ژمارەیـەک ئەفسـەری بەریتانی پێکران و هێزی دوژمن ڕاوەدوو نران. کۆتـایی بـەهاری سـاڵی 1919یـش کڵپـەی ئـاگری خـەبات هـەموو ناوچـەی نێـوان کـەرکوک و سـلێمانی ی گرتـەوە و ئینگلیزەکـان چـەند جـارێک شـکێنران تەنها لەوشـەڕەدا کـە لـەنزیکی تاسـلوجەوە ڕۆژی 23ی مایســی ســاڵی 1919 قــەوما شۆڕشـگێرانی کـورد، بـەپێی سەرچاوە بەریتانیاییەکان خۆیان، توانییـان ژمارەیـەک سـەربازی ئینگلیز بکوژن و 4 زرێ پۆش و 19 ئوتومبیلی فۆردیان بشکێنن.

دەنگوباسـی ئـەم ڕاپـەڕین و هەراوبگراڤـەی کوردسـتان زۆر ناوچـەی عـێراقی گرتبـۆوەو کـەوتبووە سـەر زاری پیـاوە سیاسـییەکانی بـەغدا و کەربـەلاو نەجـەف و شـارەکانی تـر. ئەمـە لەلایەکـەوە بـووە هۆیـەکی تری دەرخسـتنی ڕووی ڕاسـتەقینەی داگیرکەری نوێو لەلایەکی تریشەوە ئیشـانی‌دا ئیسـتعمار ئـەو قـەلا ئەبەزیوە سەختە نییە کـەس پێـی ئەوێرێ، بەڵکو ئیرادەی گەل بۆی هەیـە سـەر بەچـەک و تفاقـە ئەبینراوەکانی ئەمیش شۆڕ بکات. ئەمـەش، بـێ گومـان، چـاوی خەڵکەکەی زیـاتر کـردەوەو ژاتـی شکاندن و بەو جۆرە ڕێگـەی بـۆ شۆڕشـی بیسـت ئـەخت کـرد. ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگی سۆڤێتی ل ن کـاتلۆف لـەو کتێبـەیدا کـە لەسـەر شۆڕشـی بیسـت دایناوە بەشێکی بۆ ئـەم باسـە تـەرخان کـردووە چونکـە بەلایـەوە ڕاپەڕینـەکانی کوردسـتان ڕێ خۆشـکەرێکی بایـەخداری ئـەو شۆڕشەن.

وێـڕای ئـەوە ژمارەیـەک کـوردی ناسـراو ئـەندامی ئـەو کۆمـەڵ و ڕێکخراوانە بوون کە دەستیان لـە ئامـادەکردن و هـەڵکردنی ئـاگری شۆڕشـدا بـاڵا بـوو، وەک "حـرس الاستقلال" کە جەلال بابان یـەکێک لە ئەندامە دیارەکانی بوو.

سەرەڕای ئەمانە کاتێک شۆڕش دەسـتی پـێکرد کوردەکـە دوورەپەرێز نەوەستا. لەو ڕۆژانەدا چـەند مەڵبـەندو ناوچەیـەکی کوردستان چالاکانە هاتنە دەست و دانیشـتوانی ئـەوانیش دژی ئینگلیزی داگیرکەر ڕاپەڕین، هەر لەسەرەتاشەوە بەشێک لەسەردارانی شۆڕش بەپێویستیان زانی جگە لە هۆزانی عەرەب هۆزە کوردەکانیش

ڕاکێشنە ناو گۆڕی خەباتەوە. ئەو کوردانەی لە بەغدا دەژیان لەهەموو خۆنیشـاندان و کۆبوونـەوەکانی دانیشتوانی ئەم شارەدا بەشداری یان کرد.

لەســـەرەتای مـانگی ئابـەوە کوردسـتان بـۆ خۆیشـی شـڵەقا، ئەوەی باری سەرشانی ئینگلیزی قورستر کرد چونکە ناچاری کردن بەشێک لـە هێزەکانیـان لـەبریتی فوراتی ناوەند ئاراستەی ئەوێی بکەن.

لە کوردستان ئاگری شۆڕش لە پێش هەموو شـوێنێکدا لەناوچە کوردییەکانی باقوبەدا تەشەنەی سـەند ڕۆژی چـواردەی ئـابی 1920کوردەکـان توانیـان قزرابـات ئـازاد بکـەن. ئەمـە دانیشـتوانی خانەقینیشـی بـەجارێک بزوانـد. پێشـمەرگەکانی ئـەم ناوچەیـە هێرشـێکی سـەرکەوتوویان کـردە سەر کۆمپانیای نەوتی بـەریتانی-ئێرانی لـە ناوچـەی نەفتخانـە. لەلایەکی تریشەوە توانییان خەتی شـەمەندەفەری نێـوان خانـەقین و بەغدا، بەغدا- کنگرەبان- کەرکوک تێک بدەن و بەو جۆرە پێوەندی ی نێـوان هێزەکـانی ئینگلـیز لـە کوردستان و ناوەڕاست و خوارووی عێراقدا بپچڕن و سەر لەو هێزانەش تێک بدەن کە ئنگلیز لە ئێرانەوە ئاراستەی گیـانی شۆڕشـگێرانیان دەکردن.

ئەم بزوتنەوانە ئینگلیزەکانیان تەواو شپرزە کردو ناچاریان کردن دەسـتوبرد هـێزێکی چـەکدار بەسـەرکردایەتی ئەفسـەرێکی شـارەزای خۆیـان بـەناوی ب. ئـەدواردەوە بنێرنـە ناوچـەی خانـەقین. ڕۆژی 16ی ئـاب دەوروبـەری دوورصـەد پێشمەرگەیەکی کورد پەلاماری ئەم هێزەیان داو لە ئەنجامی شەڕێکی دووسـەعات و ئیوارەدا ڕێگـەی پێشـکەوتنیان لێ گرتـن. ئەوسـا ئینگلیزەکـان ناچار بوون هێزی تریان بۆ بنێرن. ئەمە بووە هۆی تێکچوونی تەرازووی هێز و مەودای ئەوەیان دایە دوژمن کە ڕۆژی 19ی ئـابی چـەند گوندێکـی ناوچـەی خانـەقین بگرنـەوەو بـۆ ڕۆژی داهاتوش بچنەوە ناوشاری خانەقین خۆیەوە. لێرە داگیرکەران باجێکی زۆریان خستە سەر دانیشتوانی شارکە بە"تاوان"ی پشتگیری شۆڕش گوناهباریان کردن.

داگیرکردنـەوەی خانـەقین نـەیتوانی تەشـەنە کردنـی ئـاگری شـۆڕش بـۆ ناوچـەکانی تـری کوردسـتان بووەسـتێنێت. دانیشتوانی مەندەلی بە عەرەب و کـوردەوە دایانـە پـاڵ شـۆڕش و



کاروباری شاریان بە سەرۆکایەتی موسا ئەفەندی‌یەوە گرتە دەست.

لەولاشەوە هۆزی دەلۆو بەشێك لە جافەکان بەسەرکردایەتی برایم خان و وەیس بەگ ڕۆژی 24ی ئابی دوای شەڕێکی کەم شاری کفری‌یان ئازاد کردو هەموو ئەو هێزانەی دوژمن کە لەوێ بوون بەدیلیان گرتن و کاپتەن سالمۆنیان بردو ئالای بەریتانی‌یان داگرت.

هەر زو دەنگوباسی ڕاپەڕینی کفری بەوڵاتدا بڵاوبۆوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی ئینگلیزەکان لە بەغدا بەیاننامەیەکی سەربەخۆیان دەربارەی بڵاوکردەوە. ئینگلیزەکان کە مەترسی‌ی ئەوەیان لێ نیشت ئاگری شۆڕش شوێنەکانی تری کوردستان بگرێتەوە هەرزوو هێزێکی گەورەیان بەسەرکردایەتی ئەفسەری سیاسی‌ی کەرکوك لۆنگریك ناردە کفری، بەشێك لە زەنگەنەو تاڵەبانی‌یەکان دایانە پاڵ ئەم هێزە.

سەرەتا لۆنگریگ هەوڵی‌دا لەرێگەی گفتوگۆوە سەردارانی ڕاپەڕینەکەی کفری قایل بکات خۆبدەن بەدەستەوە. بەڵام ئەوە دادی نەدا چونکە شۆڕشگێڕانی ناوچەکە سوور بون لەسەر بەرگری. ئەوساکە هێرشی ئینگلیز دەستی پێ‌کردو شۆڕشگێڕان ناچار بوون بکشێنەوە ناوچە سەختەکانی دەوروبەری شار. کە لەوێوە بەکوشتنی کوڕی سەردارێکی کوردیان زانی لەوەڵامدا کاپتەن سالمۆنیان کوشت کە تا ئەوکاتە وەك بارمتە گلیان دابۆوە. کوشتنی سالمۆن لۆنگریگی تەواو شێتگیر کردو ئەویش لەوەڵامدا 10 هەزار ڕوپیەو 500 تفەنگ سزای خستە سەر دانیشتوانی کفری.

ڕاپەڕینە بەجەرگەکەی کفری هۆزەکانی ئەو ناوچەیەیان بزواند. بەیاتی‌یەکان توزخورماتویان ئازاد کرد. لەناو شاری کەرکوکیشدا کۆمەڵێکی سیاسی‌ی نهێنی کەوتە خۆ ژمارەیەك لە نیشتمانپەروەران هەوڵیان‌دا بەیاریدەی شێخ قادری سیامەنصوری پێ بە هێزەکەی لۆنگریگ بگرن و ڕێگەی نەدەنێ بگاتە کفری. بەڵام لۆنگریگ کە بەمەی زانیبوو بەر لەوەی بچێتە کفری هێرشی بردە سەر دێکانی شێخ قادر و دوای شەڕێکی چەند سەعاتی و بەیاریدەی فڕۆکە کاول کردن و بەو جۆرە نەخشەی شۆڕشگێڕانی ئەم ناوچەیەی پوچ کردەوە.

هەرچی ناوچەی سلێمانی بوو لەبەر چەند هۆیەکی تێکەڵ نەیتوانی لەرۆژانی شۆڕشی بیستدا دەورێکی ئەوتۆ ببینێت، بەتایبەتی چونکە هەمووی چەند مانگێك لەوەبەر ئینگلیزەکان توانیبوویان دەست لە نیشتمانپەروەرانی بووەشێنن و سەردارانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوای دوور بخەنەوە. وێڕای ئەوە مێجەر سۆنی حاکمی شاریش توانی‌ی ژمارەیەك سەرەك هۆزی ناوچەکە بکڕێت و تەنانەت دەستەیەك ئاغای پشدەری هێزی تایبەتی‌ی خۆیانیان بۆی نارد کەویستی بەمۆیانەوە خەڵکی ناوچەکە چاوترسێن بکات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەند وردە ڕاپەڕینێکی ناوچەیی لەو ڕۆژانەدا تەقینەوە، وەك لەسەنگاوو لەناوپیاوەکانی مەحمود خانی دزلیدا. وەزعی هەولێر و دەوروبەری گەلێك لەوە ئاڵۆزتر بوو. هێشتا لەناوچەی قوراتی ئاوەندا شەڕ دەستی پێ نەکردبوو کاتێك دانیشتوانی هەولێر چەند جارێك کۆبوونەوەو پشتگیری‌ی داخوازی‌یەکانی شۆڕشیان نیشان دا. خەڵکی دەرەوەی شاریش باری سیاسی‌ی ئاڵۆزاوی ئەو ڕۆژانەیان بەهەل زانی و ئەوانیش کەوتنە خۆ. دەستڕێژیان لەکاپتەن هێ‌ی (Hay) کردو چەند جارێکیش پەلاماری یەکێك لە یاریدەدەرەکانیان دا کە سەیر لەمەرگ ڕزگاری بوو.

باری سیاسی‌ی هەولێر وا ئاڵۆز بوو کە جێگری حاکمی سیاسی گشتی ئەوسای عێراق ئارنۆڵد ویلسنی ناچار کرد ڕۆژی 8ی ئەیلول بۆ خۆی بەفڕۆکەیەکی تایبەتی بچێتە ئەوێ. لەهەولێر ویلسن لەگەڵ ئەفسەر و کاربەدەستانی ئینگلیز و ژمارەیەك سەرەك هۆزی کوردو گەورە پیاوانی شار کۆبۆوەو باسی "سەرکەوتنە گەورەکانی" ئینگلیزی لەناوچەی قوراتی ئاوەندا بۆ کردن و داشی بەگوێیاندا کە گوایە "وەزعی سلێمانی هێمنە".

بەڵام ئەهاتنی ئارنۆڵد ویلسن و ئەهەڕەشەو گوڕەشەکانی دانیشتوانی هەولێرو دەوروبەری چاوترسێن نەکرد. هەر پاش گەڕانەوەی ئەو بۆ بەغدا بەماوەیەکی زۆر کەم ئینگلیزەکان بەرپیلانەیان زانی‌کە نیشتمانپەروەرانی هەولێر بۆ دەرکردنیان و دامەزراندنی حوکمێکی خۆبەخۆ دایانناوبوو، بۆیەکا ناچار بوون لەدوو قۆڵەوە، یەکێکیان لە کەرکوکەوەو ئەوی تریان لە موسڵەوە، دوو هێزی نوێ بنێرنە سەر هەولێر. ژمارەیەك ئاغای دزەییش بەدەنگیانەوە هاتن و بەو جۆرە توانی‌یان هەولێر دابین بکەن. بەڵام ئەمە کارێکی ئەوتۆی





ئەگەردە سەر باری ئاڵۆزاوی ناوچەکانی سەر بەهەولێر. سورچی یەکان ئەو ڕۆژانەیان بەهەل زانی و ڕۆژی یەکی ئەیلول باتاسیان ئازاد کرد و دوای ئەوە ڕوویان کردە ڕەواندز و هێزێکی لیوی یان لەوێ ئابلۆقەدا. سورچی یەکان لەشەڕێکی قورسدا لەڕەواندز 18 سەربازی لیوی یان کوشت.

دوای ئەوەندە هێزەی لەڕەواندز بوو خۆی پێ نەگیرا و ناچار کشایەوە هەولێر. دوابەدوای ڕەواندز کۆیەش شڵۆقا و ڕۆژی 8ی ئەیلول ئەفسەری سیاسی ی شار هەڵهات.

باری هەرێمی بادینان زۆر لەوە باشتر نەبوو. ڕووداوەکانی کوردستان خۆی و کوشتنی کاپتەن لیچمەن لەلایەن شۆڕشگێڕانی هۆزی زەوبەعی ناوچەی ڕومادی یەوە تەواو هەستی دانیشتوانی بادینانیان دژی داگیرکەر بزواندبوو. لیچمەن، بەپێی بەڵگەیەکی نهێنی فەرەنسی بۆ ڕەقێتی لەوێنەی نەبوو. هەمووی ساڵێک لەوەپێش کاتێک ئەفسەری سیاسی ی موسڵ بووویستی نزیکەی هەزار خێزانی بادینی دەربەدەر بکات و زەوی ی بارو باپیرانیان لێ زەوت بکات بەو نیازەی خەڵکی تر لە جێگەیان نیشتەجێ بکات، بۆیەکا دانیشتوانی ناوچەکە زۆر لێی داخ لەدڵ بوون. هەواڵی کوشتنی هێندەی تر خەڵکەکەی بزواند. عەقرە لەو کاتەدا شڵۆقا، کوردە یەزیدی یەکانیش هەر لەسەرەتاوە پشتگیری ی شۆڕشیان کردو یاریدەی ئەو هێزەیان دا کەهێرشی بردە سەر تەلەعفەر. بەڵام دوو دڵی ی کۆمەڵی عەهدی عێراقی کە کاروباری شۆڕشی لەناوچەی موسڵدا دەبرد بەڕێوەو کەمتەرخەمی جەعفەر عەسکەری کە سەرۆکێکی ناسراوی عەهدبوو، بوونە هۆی ساردبوونەوەی شۆڕشگێڕانی ئەم ناوچەیە کە لەبەر ئەوە نەیانتوانی دەورێکی ئەو تۆ ببینن.

تا دەوروبەری کۆتای هاوینی ساڵی 1920 هێزەکانی ئینگلیز توانییان ئاگری شۆڕش لەزۆربەی ناوچەکانی باشووری عێراقدا دابمرکێننەوە. دیارە ئەمە لە کوردستانیشدا ڕەنگی دایەوەو ترسی خستە دڵی سەرەک هۆزانی. خۆشناوەتی و گەردی یەکان کەوتنە گفتوگۆ لەگەڵ ئینگلیزەکاندا و پەیمانیان دانێ دژیان نەوەستن و هەر زیانێکیان لەو ناوچانەدا لێ کەوتووە بۆیانیان بژمێرن. سورچی یەکان و ژمارەیەکی زۆر لەسەرەک هۆزانی کەرکوک و سلێمانیش کەوتنە خۆ نزیکخستنەوە لە ئینگلیزەکان.

هەرچەندە گەلی کورد توانی کەڵک لەو بارودۆخە وەربگرێ کە شۆڕشی بیست هێنایە کایەوەو بەخوێنی ڕۆڵەکانی لاپەڕەیەکی پڕ لەشانازی ی بۆ خۆی تۆمارکرد، بەڵام بێگومان، دەیتوانی دەورێکی لەوەیش گەورەتر ببینێت. دیارە ئەوە لە خۆڕا نەبوو، بەڵکو ئەنجامی گەلێک هۆی پێکەوە بەستراو بوو. بەر لەبەرپا بوونی شۆڕشی بیست بەماوەیەک ئینگلیزەکان توانیبوویان بە توندی دەست لە هێزە نیشتمانی یەکانی کوردستان بوەشێنن. کەمتەرخەمی ی سەرکردایەتی شۆڕش دەورێکی لەوەیش زیاتری بینی، "مكتب الثورة"، کە بەڕێوەبردنی شۆڕشی کەوتبووە ئەستۆ، نەیتوانی تەنانەت تاقی لقێکیش بۆخۆی لەکوردستان دابمەزرێنێت. سەردارانی شۆڕش لە مەسەلەی کورد نەدەگەیشتن، بۆیەکا هیچ کامێکیان نە لەوتارێکداو نەلە بەیاننامەیەکداو نەلەسەر لاپەڕەی یەکێك لەدوو ڕۆژنامەکەی شۆڕش "الفرات" و "الاستقلال" نە لەدوورەوەو نەلە نزیکەوە توخنی نەکەوتن و هیچ ڕێگەیەکیشیان سەبارەت سیاسەتی نەتەوەیی ئەو حوکمەتە سەربەخۆیەی دەیانویست دایمەزرێنن، دیاری نەکرد. هەرچەندە بەپێی نەخشەی خۆیان دەبوو کوردستانی باشووریش بگرنەوە. ئەم کەمتەرخەمی یەی سەرکردایەتی شۆڕش لەوەدا زیاتر خۆ دەنوێنێت گەر بێتو بزانین ژمارەیەک نیشتمانپەروەری وەك ڕەفیق حیلمی و فایقی تاپۆ لەگەرمەی شۆڕشدا هەوڵیان دا لەڕێگەی مستەفا بەگەوە، کەیەکێك بوو لە کوردە شۆڕشگێڕەکانی بەغدا، پێوەندی ی لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕش ببەستن.

لەلایەکی ترەوە ئینگلیزەکان بەهەر چوار لادا هەلپەی ئەوەیان بوو ئاگری ئاکۆکی ی نەتەوەیی و ئایینی خۆش بکەن. لەم ڕێگەناهەموارەوە توانییان بەشێك لەخەڵکی ساکاری کوردستان هەڵبخەڵەتێنن و بیانکەنە گیانی ئەو شۆڕشگێڕە کوردانەی گوایە بەپێی قسەی ئەوان "کەوتبوونە ژێر تاسیری عەرەبە شیعەکانەوە".

کەین و بەینی ئینگلیز بێ بەر نەبوو. کۆنسوڵی بەریتانی لە کرمانشا توانی بەشێك لەهۆزی سنجاوی فریو بدات وبەچەکەوە بیانکاتە سەر شۆڕشگێڕانی خانەقین و کفری. بەشێکیش لەهۆزی کەڵهوڕ بەدەنگ ئینگلیزەوە هاتن و بوونە یاساوڵی پاراستنی کانە نەوتەکانی نزیك خانەقین. لەو لاشەوە ئینگلیزەکان توانیان چەند دەستەیەکی فەلە هەڵخەڵەتێنن و بیانکەنە گیانی شۆڕشگێڕانی کوردستان ناوەندی ئەیلولی 1920 شەڕێکی قورس لەنێوان ئەوان و شۆڕشگێڕانی کوردا لەسەروو موسڵەوە قەوما. بەپێی سەرچاوە ئینگلیزیەکان کوردەکان لەو شەڕەدا نزیکەی 60 کەسێکیان لێکوژراو 140یشیان لەناوی زێی گەورەدا خنکان.

هەرچەندە شۆڕشی بیست سەرنەکەوت بەڵام گەلێك دەرسی دایە گەلی عێراق بەعەرەب و کوردیەوە. یەکێك لەو دەرسانەی دەرخستنی بایەخی خەباتی هاوبەش بوو، ئەو خەباتەی دەبوو ببێتە بەردی بناغەی هەموو بزووتنەوەیەکی ڕزگاریخوای سەرکەوتووی گەلی عێراق.



# ئافرەتی کورد

ئافرەتی کورد لای گەڕیدە ئەوروپایی یەکان. ئاواتی حاجی قادر و مەلای گەورە و گۆران و بێکەس و قانیع وهێمن. زمانی خەسو. کچی خوێندەوا ی هەولێر و سلێمانی. حەپسە خان و مینا خان. کچانی زانکۆی بەغدا.

گەڕیدە ئەوروپایی یەکان گەلێکیان بە شانو باهووی ئافرەتی کو دا هەڵداوە، بە ڕادەیەك جارو بار خۆماشمان لەبیر دەچێتەوە. وا بزانم ئەو گەڕیدانە بێ نیازی خراپ کەمێك زۆر ڕۆیشتون، وا دیارە کە لە کۆڵانە تەسکەکانی شارە داخراوەکانی ڕۆژهەڵاتەوە هاتوونە ناو شاخ و داخە کراوەکانی کوردستانەوە کەمێك سەریان لێ تێکچووە بۆیەکا ئافرەتانی کوردیان لە ئافرەتانی دەورووبەریان باشتر هاتوونەتە بەر چاو.

ڕاستە ئافرەتی کورد پێ خاوس نی یە، بەڵام ئافرەتانی هەموو ناوچە شاخاوی یەکانی جیهان هیچ کاتێك هیچ کامیان پێ خاوس نەبوون چونکە نە سەرما و سۆڵەی زستان و نە تەڵەزمی بەردی شاخەکان ڕێگەی پێ خاوسی ی نادەن. هەر ئافرەتێکی دەشتەکانی هندستان بهێنیتە ناو شاخەکانی کوردستان دەبێت نان لەدەمی خۆی و زارۆڵەکانی بگرێتەوە تا پارەی جوتێك پێڵاو بۆ خۆی و بۆ ئەوان پاشەکەوت دەکات.

بە هەمان دەستوور ئافرەتی لادێ ی کورد کەمێك لە ئافرەتی لادێ یی چەند شوێنێکی تر پۆشتە ترن، حەزیان لە ئاڵ و واڵا زۆرە، جل و بەرگیان دڵ دەکاتەوە، بەڵام ئەمیشیان بەرهەمی سروشتە، ئەو ئافرەتە چاوی بە سەوزایی و شینایی و گوڵاڵە سوورەی دڵفرێن کردۆتەوە و هەمیشە ئەو ڕەنگانە دڵ و هەستیان بزواندووە. خۆ ئەگەر تەواو پۆشتەش نەبێت ئەوا بەرگەی بەفرانبارێك ناگرێت.

دیسان ڕاستە ئافرەتی لادێ یی کورد عەبا و پەچەی نەزانیوە، بەڵام هەر ئەوەمان مابوو ئەو ئافرەتانە بە عەباو پەچەوە بەناو دڕك و داڵی ناو کەندەڵان و چڕە داری لێڕان و لێشاوی ئاوی ناو گەلی یەکاندا مەشکەو هەمانەی پڕ بگوێزنەوە. هەر ئافرەتێکی عەجەم ڕێی بکەوتایە کوردستان دەبوو بەر لەوەی دەست بۆ هیچ بەرێت عەباو پەچەکەی فڕێ بدات. بڕواننە سەیرانە تێکەڵەکانی ئیمڕۆش دەبینن باجی ڕەعنا و باجی مرووەت وەك کنێر وەك ڤیان بێ عەباو پەچە هاتوچۆ دەکەن.

مەبەستم لەو قسانە ئەوەیە بڵێم ئافرەتی کورد نە هیچی لە کەس زیاترەو نە هیچیشی لەکەس کەمترە، کەی، بێکەس وتەنی، " گیرۆدەی دەستی زوڵم " بوو ئەوسا کە وەك هەموو دەستە خوشکێکی گیرۆدەی تری دواکەوتوو دەبێت و شەقڵی ئەو دواکەوتنەی پێوە دیار دەبێت. وا بزانم لەگەڵمان گەر بڵێم پێویستە کورد لە هەموو کەس زیاتر لە دالغەی ڕۆمانسی یەوە بە دوور بێت.

ئافرەتی کورد، وەك هەموو ئافرەتانی جیهان، بە درێژایی مێژوو گیرۆدەی بێ مافی ی و زۆرو ستەمی کۆمەڵ بووە. ژمارەیەك لە داب و نەریتە هەرە ئاشرینە دەستکردەکانی ژیان ڕەگ و ریشەیان لەناوماندا داکوتاوە.

لەلادێکان هێشتا ژن بە ژن و شیربایی هەر ماون. تەنانەت لە شارەکانیش دەگمەن کچمان بە ئارەزووی خۆی شوو دەکات. مارەیی و پەڵپ و ناز و نوزی ماڵە کچ بوونەتە کۆسپێکی گەورە لە بەردەم ژن خواستندا، قانیع حەقی یە " مارە بڕینی "ناو ناوە " بە پارە کڕین ". تا دوێنێ هەبوون شانازی یان دەکرد کەتەنە لۆکە بەشێك لە نیشانەی ماڵە زاوا بوو، هەشبوون هەر بۆ ئەوە لێك بە لالغاوەیاندا دەهاتە خوارێ، نەیاندەزانی چۆن یۆڕی ئەو " بیر تێژانە " بدەن کە لۆکەیان کردە دیاری ی دەستیان

پێوەنـــدی‌ی نێـــوان بـــوك و خەسوی ئیمڕۆمـان جیاوازی‌یـەکی ئەوتۆی لەگەڵ ڕابوردوماندا نی‌یە، جاری وا هەیـە خراپـتریش بـووە، بەڵگەش ئـەو وشـە نوێ‌یـەی نـاو زمانی کوردی‌یە کە بوکەکانمان ڕێك و پێك بۆیـان داتاشیوین بـەوەی " صبـــار " ی ئـرك ژەهـــراوی‌ی عـەرەبی‌یان کردۆتـەوە (زمـانی خەســـو). بـــڕوا ناکـــەم پرۆفیســۆرەکانی زمـان و ئـەدەبی کوردی قەت بۆ زاراوێکـی وا لـەبار بچوبانە!

نـەخوێندەواری‌ی بـاڵی ڕەشـی بەســـر زۆربـــەی هـــەرە زۆری ئافرەتانی کوردستاندا کێشاوە. ئەم نمونەیـە لـە ڕابـوردووی نزیکمـان دێنمەوە:

ســـاڵی 1952 لـــە هـــەموو پارێزگای هـەولێر تەنها 759 و لە هـەموو پارێزگـای سـلێمانی تەنـها 1132 کـچ دەچوونـە قوتابخانـــەی سەرەتایی. ئەوانەی هـەولێر هەموو بەســـەر یەکـــەوە 39 و ئەوانـــەی سلێمانیش49 مامۆستای ئـافرەت دەرسیان پێ دەگوتنەوە. هـەر ئـەو ساڵە لە پارێزگای هـەولێر 131288 ئافرەتی نیشتەجێ هەبوون، ژمارەی ئەوانەیان کە لە پێنج ساڵان زیاتر و نـەخوێندەوار بـوون گەیشـــتبووە 107940 کـــەس. هـــەمان ســـاڵ ژمـــارەی ئافرەتـــانی پارێزگـــای سلێمانی بێ کۆچـەرەکانی خـۆی دەدا لـە 124633 کـەس، ژمـارەی ئەوانەیان کە لە پێنج ساڵان زیاترو نـەخوێندەوار بـوون گەیشـــتبووە 101886 کـەس. لەبەر ئـەوە هیـچ سەیر نی‌یە هەر ئەو دەوروبەرە لـە پارێزگـای هـەولێر لـە 824 منداڵـی تازە لە دایك بوو لە ساڵێکدا 522 یان و لە سلێمانی 523 منداڵی تازە لـە دایـك بـوو 361 یـان بـە خـاك سپێردران.

نامەوێت زیـاتر دڵگیرتـان بکـەم بۆیـە کـا لـەو ژمـارە زۆرانـــەی دەربـارەی پێـش پـەنجاکان کـۆم کردوونەوە هیچتان بۆ ناهێنمەوە.

بـە داخـــەوە تـا ئیمـــڕۆش ڕووناکبـیرانی کـورد، دەســـتەیەك شـاعیریان ئـەبێت، وەك پێویســـتە هەستیان بـەم کەلێنـە گەورەیـــەی ژیـانی گەلەکـەیان نـەکردووە، گـەر نەگەڕابێتـە دواوە هیـچ نەچوینەتـە پێشـەوە. " کوردستان" ی یەکـــەمین ڕۆژنامەی کوردی‌ی کۆتای سـەدەی ڕابـوردوو چـەند جـارێك لـــەو شوێنانەیدا کـە بـە نـاوی ئاییـنەوە کـوردی بـــۆ خوێنـــدن هـــان داوە ئـافرەتو پیـاوی تێکـەڵ کـردووە، کـەچی دوای نزیکـــەی نیو سەدە کون و قوژبنی ژمـــارەی ســـاڵێکی گۆڤارێکی وەك " هـاوار" دەپشـکنیت بێ ئـەوەی هـاوارێکی بـۆ ئـافرەتی کورد تێدا بدۆزیتەوە.

لـەم مەیدانـەدا، وەك زۆر مـــەیدانی‌تری ژیـــانی ڕووناکبیریمان، شاعیران بـۆڕی ئـەوانی تریـــان داوە "ئـێر و مــێ" لای حـاجی قـادری کۆیـــی فەرقیان نـەبووە. مـەلای گەورە چـەند جارێك لـە شـیعرەکانیدا بـە وردی هاتۆتـــە ســـەر باســـی ئافرەتی کورد، بۆ چاکە هانی داون و بە توندی ڕەخنـــەی لـــەو داب و نەریتانـــە گرتـــووە کـــە ئـافرەت گیرۆدەیـــانن. مـــەلای گـــەورە وەك باوکێکی دووربین بەر لە هـــەموان لـــە کۆیـــە کچەکانی خۆی خستە بەر خوێندن. بێکەسیش بـــە گـــەرمی ئـــافرەتی کوردی بـــۆ تێکۆشـانو سەرپۆش فڕێ دان هان دەدا. لـــە چلـــەکاندا " نەســـرین ئەمێکـــە" ی بێکەس ببوە سرودێکی نیشـــــــــــتمانی‌ی ئازادیخوازانـی کـــورد دەوروبـــەری ئـــارەندی ســـاڵی 1944 کـــاك شـــەوکەت محەمـــەد ئاوازێکی ناسکی بۆ دانا). " قەڵشی کوڵمـــی ســـووتاوی کچـــی لادێ " "وەرەنجەڕۆیی" کیژی شێخ و کیژی حـاجی و کیـژی ئاغـا " سـەرنجی هێمنی موکریانی‌یان ڕاکێشا. گۆران " توندو تیژترین دەنگی بێزاری‌ی لە بـاری پـڕ جـەورو سـتەم و دواکـەوتووی ژیـانی کـوردەوە" دەربڕیوە.

کـــەسمان نی‌یـــە نـــەزانێت کەئافرەتی کورد بـەش بـە حـاڵی خـۆی لـە کـۆڕی خـەباتدا درێغـی‌ی نـەکردووە. لـێرەدا تەنـها چـەند ڕاستی‌یەکی کەم زانراو یا نەزانراو دەخەمە بەر چاو.

حەپسەخانی نەقیب ئافرەتێکی لێ هـــاتوو بـــوو، لـــە بیســـت و سی‌یەکاندا چـەند جـارێك نامـەی تایبـەتی‌ی نـاردووە بـۆ بارەگـای یەکیـەتی نەتـەوەکان لـە جنێـڤ و تێیـدا باسـی ئـەو جـەورو سـتەمە زۆرەی کـردووە کـە بەسـە رکـورد هاتوون. ئەو نامانە ئێستە بوونەتە بەڵگـەی گرنـگ بـۆ لێکۆڵینـەوەی مێـژووی نوێـی گەلەکـەمان. مینـا خانی هاوسەری قازی محەمـەدی نەمر لە ڕۆژگاری کۆماری مەهاباددا جێگـەی حەپسـە خـانی نـەقیبی گرتبـــۆوە. وا دیـــارە خـــەریکی دامـــەزراندنی یەکـــەم ڕێکخـــراوی ئافرەتان بووە.

لە سـەردەمی پاشـایەتیدا کچـە کوردەکانی زانکۆی بـەغدا ئازایانـە لەخۆنیشـاندانە نیشـتمانی‌یەکان و ئاهەنگـە نهێنی‌یـەکانی نـەورۆزدا بەشدار دەبوون. ئەم ئاوانە بەشێکن لە وانەی بە چاوی خۆم دیومن و لـە بـیرمن : خوالێخۆشـبووان ڕونـــاك زوهـدی و نـەوزەر نـوری، نـازەنین سالح قەفتان، حۆری‌ی عـەلی ئاغـا، درەخشان عارف نەجیب، شەوقی‌یە ئەحمـەد، درەخشـان شـێخ جـەلال، زەکێی عومـەری سام ئاغا، سورەیا محەمـەد، نـەزیرە ڕەشـید، ناجی‌یـە مسـتەفاو گوڵشـــەن ڕەوانـــدوزی‌و ژمارەیـــەکی تـــر کـــە بـــە داخـــەوە نایەنەوە یادم.

هیوادارم باری ژیانی ئافرەتانی کـورد مێـژووی بزوتنـەوەیان زیـاتر سەرنجی نووسەرانمان ڕابکێشـن و گەلێك بەرهەمی تری وەك " ئافرەت لـە چـیرۆکی کـوردی‌دا" ی کاکـە صەباحی غالب و " خەباتی شیعری کـــوردی لـــە پێنـــاوی ئـــازادی‌ی ئافرەتـــان دا" ی کاکـــە حەمـــەو "ئـافرەتی لادێـی کـورد"ی کـاك بورهان قانیع بەشێك لە کەلێنەکانی کتێبخانەی کوردی‌ی پڕ بکەنەوە.



کەمال مەزهەر لە سیڤەری نزیك پاریس لەنێوان پرۆفیسۆر و جۆیس بلۆو دوکتۆرە گالیتی‌دا کاتی کۆنگرەی کوردو شار ئەیلولی 1996

# خاسیەت و ڕۆژگاری ڕێنیسانس

لەکتێبی ڕێنیسانسدا :

**مەفهوومی ڕێنیسانس :**

"ڕێنیسانس" لە ئەنجامی حەتمی کۆمەڵێک هۆی ناوخۆیی و دەرەکیدا هاتە کایەوە و پێکەوە لە مناڵدانی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی ئەوروپادا کاری خۆیان کرد. کەواتە ڕێنیسانس بە حوکمی ئەو واقیعەی تێیدا لە دایک بوو، چ لە شێوەی تێڕوانینیدا بۆ دیاردەکانی ژیان و چ لە بیرکردنەوەدا، ڕێبازێکی نوێی گرتە بەر، تەواو بە پێچەوانەی بیروڕای باوی کۆمەڵی کۆن و پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکانەوە بوو. بەتایبەتی چونکە لە ڕۆژگاری ڕێنیسانسدا ئەو پەیوەندییە کۆنانە لەلایەک بوو بوونە بار بەسەر شانی کۆمەڵانی خەڵکییەوە و لەلایەکی تریشەوە تەعبیریان لە سیستەمی کلیسەی کاتۆلیکی و هەڵس و کەوتی دوگمایەتییانەی ئەکرد و کۆسپێکی گەورەشیان لەبەردەم داهێنان و بیری نوێی پەرەسەندوودا دانا بوو. زانایان لەم بارودۆخە تازەیەدا کەوتنە خۆو شێوازی نوێی جۆربەجۆریان دەدۆزییەوە تا بەهۆیانەوە بەربەرەکانێی سیستەمی کۆن و بیروباوەڕی باوی دەرەبەگایەتی پێ بکەن و پەردەیان لەسەر هەڵبماڵن. بۆ ئەم مەبەستە ڕێگای ژیاندنەوەی کەلتوری کۆنیان گرتە بەر، بە تایبەتی کەلتووری یونانی. ئەوانە وا بۆ مەسەلەکە دەچوون گوایە بە هۆی ژیاندنەوەی کەلەپووری کۆنەوە دەتوانن لە کۆت و پێوەندی سەدەکانی ناوەڕاست دەرباز بن و باشتریش دەتوانن لە یاساکانی سروشت تێ بگەن.

لەم ڕوانگەیەوە ئەم ڕێبازە فیکرییە نوێیە بەناوی ڕێنیسانسەوە ( Renaissance ) کە بەزمانی فەرەنسایی واتای "ژیاندنەوە" یان "زیندووکردنەوە" یاخود "لەدایک بوونی نوێ" دەگەیەنێ کەوتە ناوناوانەوە و پیاوانی ئەو ڕۆژگارە بۆ یەکەمجار بەکاریان هێنا لای ژمارەیەک فەیلەسووف و مێژوونووس، سەرپاکی مێژووی مرۆڤایەتی بە زلەو سەدەیە ڕووداوێکی لە ڕۆژگاری ڕێنیسانس گرنگ و مەزنتری بەخۆیەوە نەدیوە. ڕاستییەکەیشی هەر وایە. چونکە چەندین داهێنان و گۆڕانی فیکریی نوێ هاتە کایەوە کە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بەو ڕۆژگارەوە هەیەو تا ئێستایش سەدان مێژوونووس و هونەرمەند و ڕەخنەگری سەر بە ڕێباز و قوتابخانە فیکری و فەلسەفییە جۆربەجۆرەکان، لای خۆیانەوە بایەخێکی لە ئەندازە بەدەری پێ دەدەن. لەبەر ئەو هۆیانە لەگەڵ ناوبەناو مشت و مڕ و بۆچوون و هەڵسەنگاندنی زانستیی جیاواز دەربکەوێن و لە خاسییەتی ڕۆژگاری ڕێنیسانس و ئەو بابەتە گرنگانە بکۆڵینەوە کەلەمەودوا هەوڵ دەدەین ڕۆشنایی بخەینە سەر لایەنە گرنگەکانی نایی بەڕێکەوت لەقەڵەم بدرێن.

**ئیتالیاو مەودای مێژوویی ڕێنیسانس :**

تا ئەمڕۆ دەست نیشان کردنی مەودای مێژوویی ڕۆژگاری ڕێنیسانس و ئەو وڵاتانەی تێیاندا دیاردەی ڕاپەڕینێکی نوێ سەری هەڵدا، یەکێکە لەو مەسەلە ئاڵۆزانەی مشت و مڕی زانستییانەی سوود بەخشی لەسەر دەکرێ، بێگومان هەموو ئەو بەرهەم و داهێنانەی لەسەدەی پانزەهەم و شانزەهەمدا هاتنە کایەوە مل کەچی یاساو ڕێبازەکەی ڕێنیسانس نەبوون. چونکە شان بەشانی بیروڕای ئەو ڕۆژگارەو کەلتووری سەدەکانی ناوەڕاست لەکاردابوو. ئەمە جگە لەوەی کە دیاردەکانی ڕێنیسانس بە تەنها وڵاتێک دوورانی نەگرتەوە و گەشاندنەوەو پاشان سیس بوونیشیان لەسە رهێڵێکی دیارو چەسپاو نەدەڕۆیشت. هەموو ئەو دیاردانە بەپێی بارو زرووفی ئەو وڵاتانە بەڕێوە دەچوون کە بوژاندنەوەیان بەخۆیانەوە دیبوو بەڵام سەرەڕای ئەم جیاوازییانەیش مێژوونووس و لێکۆڵەران باوەڕیان وایە کە ئیتالیا لانکەی ڕێنیسانس و بزووتنەوەی مرۆڤایەتییە.

ئێمەش لەم بۆچوونەوە دەتوانین بیروڕایەکی گشتیی سەبارەت بە ڕۆژگاری ڕێنیسانس بخەینە بەر دەست و قۆناغە سەرەکییەکانی دەست نیشان بکەین.

لە ئەنجامی چەند هۆیەکی دیاریکراودا کە هەر یەکەیان بەم یان بەوشێوەکاریان لەوی تر دەکرد بیروباوەڕی ڕێنیسانس لەوڵاتی ئیتالیادا بەر لەوڵاتانی دیکەی ئەوروپا خۆی نواند ئەم وڵاتە لە کۆتایی سەدەی ناوەڕاستدا زۆر بەخێرایی بەرەوپێش دەچوو. لە سەدەی یانزەهەم بە دواوە ئابوری ئیتالیا بە تەواوی پشتی بە بازرگانی دەرەوە بەست و ئەنجام وزەو توانای کەشتییەکانی لەدەریای سپی ناوەڕاست دا ڕۆژ بە ڕۆژ بەهێزتر دەبوون و توانی هەموو ئاڵ و گۆڕێکی نێوان ئەوروپاو ڕۆژهەڵات بۆخۆی قۆرخ بکا. چونکە ئەوە تورکەکان بوون کە کەلوپەلی داتسفە بەهارات و ئاوریشم و عەتر و خشڵی زێڕو زیو لە وڵاتانی ئەوروپادا بازاڕێکی بەفرۆختیان هەیە؛ دیارە لەئەنجامی ئەم ئاڵ و گۆڕەیش ئیتالیاییەکان قازانجی زۆریان دەست کەوت، بەڕادەیەک "هەریەکەیان لە جاران زیاتر دەوڵەمەند بوون" هێشتا سەدەی سیانزەهەم کۆتایی نەهاتبوو، ئیتالیا لە مەیدانی ئابوری کۆمەڵایەتیدا ڕێزی پێشەوەی داگیر کردو شارەکانیشی لە وڵاتانی دی زۆرتر پێش دەکەوتن. تەنها لەشاری "ڤینیسیا"دا ژمارەی ئەو کرێکارانەی لە پیشەسازی چنینیدا کاریان دەکردگەیشتە "16" هەزار و لە پیشەسازی کەشتی دروست کردندا ژمارەیان خۆی دا لە "6" هەزار کەس. جا ئەگەر ژمارەی یەکەمیان ئاوێنەیەکی بێ گەردی پێشکەوتنی پیشەسازیی بێ لە شارێکی وەک "ڤینیسیا"، ئەوا ژمارەی دووەمیان ئەوە دەگەیەنێ کە تا چ ڕادەیەک بازرگانیی گەشەونمای کردووە و چەندیش پێویستی بەو هۆیانە بووە تاوەکو کاڵ و پەلەکانی لە دەریای سپییەوە بەرەو دەریای سوور بگوێزێتەوە.

دانیشتوانی "ڤینیسیا" وەک تێکڕای شارو بەندەرەکانی دیکەی ئیتالیا، بێ دوودڵی خۆیان دەکوتایە هەر مەیدانێکی بازرگانییەوە بە مەرجێک بیانزانیایە قازانجیان مسۆگەرە. تا حاڵ گەیشتە ئەوەی چەندین بازرگان خەریکی کڕین و فرۆشتنی کۆیلەی سپی بوون و بەردەوام کۆششکی میرو خەلیفەکانی ڕۆژهەڵاتیان بە ئافرەتی "یونان"ی سیخناخ دەکرد، بێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەو بڕیارەی "پاپا" دەری کردو تێیدا کڕین و فرۆشتنی ئافرەتی بەکارێکی دژ بە یاساو نەریتی ئاینی مەسیحی لە قەڵەم ئەدا. دەڵێن تەنانەت ئەو بڕیارەیش هیچ شوێنەوارێکی لە دڵ و دەروونی بازرگانەکاندا بەجێ نەهێشت، چونکە "بازرگانییەک بوو قازانجی زۆری لە دوا بوو".

شاری "جەنەوا" و "فلۆرەنسا" و چەند شارێکی دیکەی ئیتالیا، شان بەشانی یەک پەرەیان دەسەند و گەشەیان دەکرد. بەڕادەیەک شاری "فلۆرەنسا" لە زۆر بواری ئابوریدا شاری "ڤینیسیا"یشی بەجێ هێشت. جموجوڵی ئابوری بەو شێوە فراوانە و پێشکەوتنی پیشەسازی و ئاڵ و گۆڕ کردنی دراو خستییە مەرقعێکەوە "کاری کردە سەر تێکڕای ئابوری وڵاتانی ئەوروپا" و سەرهەڵدانی یەکەمین دامەزراوی شێوە سەرمایەداری لەسەر ئاستی هەموو جیهان بۆی بووە شتێکی سروشتیی. هەر لە "فلۆرەنسا"دا یەکەمجار پەیوەنییەکانی دارایی "الاتحاد المالی" هاتە گۆڕێ و ژمارەیەکی زۆر پیشەگەرو بازرگان تێیدا کۆبوونەوە. ئەو ترۆستانە سەرپەرشتی هاوردن و هەناردنی کاڵ و پەلیان دەکرد.

لە سەدەی چواردەهەمدا ژمارەی کارگەری پیشەگەرە گەورەکانی "فلۆرەنسا" کە گەیشتبوونە قۆناغی مانیفاکتۆرەو قوماشیان بەرهەم دەهێنا لە "200" کارگە تێپەڕی کرد. گەشەکردنی پیشەسازی بەو خێراییە بووە هۆی ئەوەی نیسبەتی کرێکاران بگاتە 80 ٪ ی هەموو دانیشتووانی شار ئەمەیش ژمارەیەک بوو نەک هەر لە ئیتالیا بەڵکو لە سەرپاکی کیشوەری ئەورووپاو جیهاندا وێنەی نەبوو.

هەر لەو قۆناغەدا لە شاری (فلۆرەنسا) دا گەورەترین بانک بەشێوە نوێیەکەی دامەزراو ئاڵ و گۆڕی بە بەهێزترین دراوی زێڕەوە دەکرد کە لەو سەردەمەدا لە هەموو ئەورووپادا هیچ پارەیەک نەیدەتوانی شان لەشانی بداو دەرگای ئیعتیمادی بۆ بازرگانەکانیش خستە سەر گازی پشت. نەک هەر ئەوەیش، بەڵکو دەستگیرۆیی وڵاتانی دیکەی ئەورووپایشی دەکردو قەرزو قۆڵەیشی دەدانێ و چەند جارێکیش یارمەتی ئینگلستانیدا. دام و دەزگای "ڤاتیکان"یش بۆ کۆکردنەوەی دەرامەتی خۆی لە ئەورووپادا، تەنها پشتی بەبانکەکانی "فلۆرەنسا" دەبەست. تا ئێستایش زۆربەی ئەو زاراوانەی گەلانی ئەورووپا لەئیش و کاری بانکدا بەکاری دەهێنن بەرگەی ئیتالیایین و هەندێکیشیان



بەهۆی پەیوەندییان بە گەلانی عەرەب و ئیسلام و بیرەتتی یەکانەوە، هاتوونەتە ناوئارانەوە. یەکێك لەرواڵەتەکانی تری گەشەکردنی "فلۆرەنسا" ئەوە بوو ژمارەی دانیشتوانی لەماوەی سەدەو نیوێکدا نزیکەی دوو ئەوەندە زیادی کرد. لەکۆتایی سەدەی سیانزەهەمدا ژمارەی دانیشتووانی گەیشتە "70" هەزار کەس، پاشان لەناوەڕاستی سەدەی پانزەهەمدا خۆیدا لە "150" هەزار ئەم دیاردەیەیش نەبێ بە پێوانەی دیمۆگرافیی سەدە ناوەنجی یەکان حسابی بۆ بکرێ چونکە لەو کاتەدا گەورەترین شاری ئەورووپا ژمارەی دانیشتووانی لە هەشتیەکی ئەو ژمارەیەی دوایی تێنەدەپەڕی. هەموو ئەو گۆڕانە بنەڕەتی یانە لە سروشتی سیستەمی سیاسی شارە پێشکەوتووەکانی ئیتالیادا رەنگیان دایەوە، زۆربەی خێزانە دەسەلاتدارەکانی ئیتالیای خستە باروودۆخێکەوە پەیوەندیەکی توند و تۆڵیان لەگەڵ کاروباری پیشەسازی و بازرگانیدا بەست و لەنیش و کاری کشت وکاڵی زیاتر بایەخیان پێ دەدا.

خێزانی "میدیچی" فلۆرەنسایی باشترین نموونەی بنەماڵەی حوکمڕانن. ئەوەی شایانی باسە، پارەدارەکان و بەتایبەتی بازرگانەکان نوێنەریان لە ئەنجوومەنە رەسمی یەکانی چەند شارێکی ئیتالیادا زۆربە نەبوون ئەم دیاردەیەیش ئەوە دەگەیەنێ کە تەوژمی بەتینی ئابووری نوێ لەوەندەی کات نەمێنشتبووەوە سەرمایەدارە ئیتالیایی یەکان خۆیان بەکاروباری ئەنجوومەنە رەسمی یەکانەوە خەریك بکەن و بەرژەوەندیەکانیان لەو پەندەدا دەبینی یەوە کە "کات لەهەموو شت بەنرختره". لەوەیش گرنگتر، بەردەوام بوونی هەر سیستەمێکی سیاسی لەشارەکانی ئیتالیادا، توندوتۆڵ بەسترابوو بەهەڵوێست و رادەی پشتگیری کردنی ئەو سیستەمەوە لەلایەن پارەدارەکانەوە، تەنانەت لەهەندێ کاتدا دام و دەزگا ئابووری یەکانیان "دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوون لەناو دەوڵەتدا".

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە هەرەس هێنانی پەیوەندی یە دەرەبەگایەتی یەکانی ئیتالیا پێش وولاتانی تر کەوت و بەحوکمی ئەو گۆڕانکاری یانە.

پێداویستی یەکانی کۆمەڵی نوێیش بەر لەشوێنانی دی لەوێ دەرکەوتن. ئەمەیش خۆی لەخۆیدا هۆیەکی بنچینەیی بوو تاوەکو ئیتالیا بکاتە لانکەی رێنیسانس. بەئەندازەیەك لەسەدەی چواردەهەم و پانزەهەمدا شاری "فلۆرەنسا" بووە مەڵبەندی هەموو جموجۆڵێك و ناودارترین پیشەواکانیشی خەڵکی ئەو شارە بوون و جێی خۆی بوو کە ناوی "پایتەختی" رێنیسانسی لێ بنرێ. شان بەشانی ئەم هۆ بنچینەیی یە، خۆمەڵێك هۆی تر لەئیتالیادا هاوبەشی یان لەگەڵ لە بوون و نەش ونما کردنی رێنیسانسدا کرد. ئەورووپا و رۆژهەڵات نەبوو، بەڵکو بەحوکمی شوێنە جوگرافیایی یەکەی، ئەڵقەی پەیوەندی فیکری ی نێوان هەردوولای پێك دەهێنا. بەهۆی ئیتالیاوە بیروڕاو دیاردە گرنگەکانی شارستانیەتی رۆژهەڵات دەگەیشتە ئەورووپا و جێ پەنجەی لە بووژاندنەوەی ئەورووپادا بەئاشکرا دیارە. ئەو دەورە گرنگەی ئیتالیا بینی، بەتایبەتی لەسالانی شەڕی خاچ پەرستاندا دەردەکەوێ و سەرجەم مێژوو نووسان لەو باوەڕەدان کە پاشەکشەی سوپای شکستەیان زۆر دیاردەی شارستانیەتی لەرۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا پەڕاندەوە بەر لە هەموو شتێك لە بووژاندنەوەی ئەورووپادا رەنگیان دایەوە.

رەگەزەکانی کەلتووری رۆژهەڵات و لەسەرو هەموویانەوە کەلتووری عەرەبی ئیسلامی، هەر زوو لە بیروبارەڕی رێنیسانسدا کاری خۆیان کرد و دواییش لەدەستکەوتەکانیدا خۆیان نواند. شتێکی بەڵگە نەویستە کە لەبەرهەمی دووکەس لەسێ پێشەواکەی رێنیسانسدا، واتە "دانتی" و "بۆکاشیو" هەست بە کارتێ کردنی داهێنانە رۆژهەڵاتی یەکان دەکرێ. لەبواری زانستیشدا ئەوەندە بەسە نموونەیەك بە بەڵگە بهێنینەوە تاوەکو لەناوەرۆك و مەودای ئەم کارتێ کردنە تێ بگەین. لە رۆژگاری رێنیسانسدا پۆرتوگالی یەکان، لە ناو هەموو دەریاوانەکانیاندا کەسێکی وەك "ڤاسکۆ دی گامایان" هەڵبژارد، تاوەکو ئەرکی دۆزینەوەی رێگایەکی نوێی بۆ هیندستان بخەنە ئەستۆ. چونکە ناوبراو پیاوێکی کردەو شارەزا بوو. ئەوە بوو بەچاکترین تفاقی شەڕی ئەوسای ئەورووپا پڕ چەکیان کرد و چی نەخشەو ئامرازی ئەستێرەناسی و زانیاری تازە دۆزراوەی ئەو کاتە هەبوو خستی یانە بەردەستی، بەهیوای ئەوەی خەرە گەورەکەیان بهێننەدی. بەڵام کە گەیشتە شاری "مالیندی"ی سەر بە "کینیا" وچاوی بە "شێری دەریا" "ئەحمەدی کوڕی ماجید" کەوت، هەستی کرد تاچ رادەیەك پێویستی بەیارمەتی ی ئەو پیاوە زانا و لێهاتووە هەیە. بۆیە بەوپەڕی رەزامەندی یەوە جڵەوی سەرکردایەتی دایە دەست بێگومان گەر ئەو نەبوایە، ئەیەو خێرایی یە نەدەگەیشتە جێ و ئەسەرکەوتنیشی بەنسیب دەبوو.

هۆیەکی تری گرنگ هەیە، وای کرد خاکی ئیتالیا بەر لە وولاتانی تر ببێتە زەمینەیەکی بەپیت و تۆوی بووژاندنەوەی تێدا چەکەرەبکا. ئاشکرایە ئەم وولاتە چەند سەدەیەك بەر لە رۆژگاری رێنیسانس بووە مەڵبەندی کڵێسە و جیهانی مەسیحی. ئەمەیش بووە هۆی ئەوەی لەدوو سەرەوە دیاردەکانی رێنیسانسی تێدا دەربکەوێ و لەدوو جەمسەری ناکۆکەوە گەشە بکاو پەرە بسێنێ.

وەك لەدواییدا بۆمان روون دەبێتەوە بەشێکی زۆری بیروڕای رێنیسانس، بریتی یە لەرەخنە لێ گرتنی کڵێسەی کاتۆلیکی کە ئەوساکە "رۆما" بوو بووە بنکەی و هەرچی بیروڕای سەلبی کڵێسەهەیە، لەشوێنانی دی زیاتر لەو شارەدا بەرجەستە دەبوو. رۆژ لەدوای رۆژیش پتر نارەزایی لە دەروونی ئەورووپایی یەکاندا بلێسەی دەسەند. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە کڵێسە ناچار بوو حساب بۆ ئەو گۆڕانکاری یە

نوێیانە بکا کە ڕێنیسانس لەگەڵ خۆیدا هێنابوونی یە کایەوە. ئەویش دەترسا ئەباوورەدەووردە کۆمەڵ لێی بتەکێتەوە. لەبەر ئەوە کەوتە خۆو چەند پیاوێکی سەر بە بیروباوەڕی نوێی لەخۆی نزیک خستەوە. تەنانەت چەند پاپایەکیان بۆ ئەوەی کلێسە دەوری خۆی نەدۆڕێنێ، بایەخێکی باشیان بەبیروڕای هومانیستان دەداو لەنزیکەوە پەیوەندییان لەگەڵ پەیدا دەکردن. هەندێکی تریشیان حەزیان بەزانست و چاودێری کردنی زانایان دەکرد. کە یەکێکیان کوری زەنگ لێدەری کلێسە پاپا نیکۆلای پێنجەم 1477 1455ز بوو. ئاوبراو بەوە ناسرابوو ڕۆشنبیرێکە ئەاو لەسەردەمی خۆی تێ گەیشتووەو دەزانێ چۆن هەڵی دەسەتگێنێ. ئەم پیاوە ڕای وابوو هیچ دژایەتی یەک لەوەدا نی یە بایەخ بە کەلتووری بەر لەزاین بدری و لەهەمان کاتیشدا دڵسۆزی ئاینی مەسیحی بێ. ئەو دەیوویست بەهۆی ئاین و "لایەنە چاکەکانی شارستانیەتی کۆنەوە سەرلەنوێ ڕۆما بکاتەوە بە پایتەختی جیهانی مەسیحی".

لەبەر ئەوە "نیکۆلای پێنجەم" بێ سێ و دوو ژمارەیەک نوسخەیەکی خۆی بە کیشوەری ئەوروپادا بڵاو کردەوە، تاوەکو چی دەستنووسی کۆن هەیە کۆی بکەنەوە سەرەنجامیش کتێبخانەی ڤاتیکانیان پێ دەوڵەمەند بوو. جگە لەوەی پەنای بردەبەر لێکۆڵەرەوەو مێژوونووسێکی بەتوانای وەک "لۆرێنزۆ ڤالا 1407-1457ز" و چەند کەسێکی تریش، بۆ ئەوەی لە ناوەرۆکی ئەو دەستکەوتانە بکۆڵنەوە. چەند پاپایەکی تری دوای "نیکۆلا" هەمان ڕێبازی ئەویان گرت بەڵام نەک بەو شێوە فراوانەی ئەو، هەریەکەیشیان تا رادەیەکی باش ڕۆڵی خۆیان لە بواری زیندووکردنەوەی کەلتووری کۆن و پشتگیری کردنی پیاوانی سەر بەرێنیسانسدا بینی. نەک هەر ئەوەیش بەڵکو هەولیشیان دەدا ووزە و توانای کۆمەڵێک لە بەتواناترین پیاوانی ڕۆژگاری ڕێنیسانس بخەنە کارو هانیان بدەن داهێنانە هونەرییەکانیان لەسەر دیوارو گومەزی بەناوبانگترین کلێسەکانی ئیتالیادا بنەخشێنن، تاوەکو بەنەمریی بمێننەوە. هەروەک لەتابلۆکانی کلێسە ناودارەکەی "پەترۆس" و هۆڵەکانی "ڤاتیکان" دا دەبینرێن. پێویستە ئەوەیشمان لەیاد نەچێ کە ئیتالیا خۆی لانکەی کەلتووری ڕۆمانی کۆن بوو. ڕۆڵێکی دیاریشی لەگەشە پێ کردنی شارستانیەتی مرۆڤایەتیدا گێڕابوو. هەر ئەم هۆیەیش بووە هاندەرێکی گرنگ و پاڵی بەزانا ئیتالیایی یەکانەوە نا، زیاتر تێ بکۆشن. چونکە ئەوانە تا ئەوکاتە لەمێژووی خۆیان نەبچڕابوون و دەستبەرداری نەبووبوون و دەتوانین بڵێین لەزۆربەی ووڵاتانی دیکە زیاتر پارێزگاریی کۆنینەی مێژووی خۆیان دەکرد. لێرەدا دەبێ ئاگاداری ئەو حەقیقەتەیش بین، کە ووڵاتی ئەورووپا لە چوارچێوەی پەیوەندییەباوەکانی ئەو قۆناغەدا، لەباری ئابووری و سیاسییەوە نەک هەر لەسەدەکانی پێشووی خەملیوتر بووە، بگرە لەهەموو لایەنێکەوە بەسەر پەیوەندییەکانی سەردەمی دەرەبەگایەتیدا باڵادەست بوو کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش بەرەو گەندەڵ بوون و لەناوچوون هەنگاویان دەنا. لەم ڕوانگەیەوە، دوژمنایەتییان دەکردو هەندێ جاریش ئاوناتۆرەی وایان لێ دەدنا ڕاستی یەکەی بەو جۆرە نەبوو. بەکورتی ئەوانە هەڵوێستی دوژمنانەیان کردە ئامرازێک بو تێک دان و هەرەس پێ هێنانی ئەو ڕژێمە بۆگەنە. سەرەنجامیش نواتییان کاری خۆیان بکەن و تەنها بەراورد کردنێکی ئاسایی دەمان گەیەنێتە ئەو حەقیقەتەی کە تاج ڕادەیەک ئەو سیستەمە ڕزیوە لەگەڵ سەدەی زووی گەشەکردوودا لەیەک دووربن.

لەبەر ئەوەی هەتا ئێرە هەر بە دەست نیشان کردنی ئەو هۆیانەوە خەریک بووین کە ووڵاتی ئیتالیایان کردە پێشڕەوی ڕێنیسانس، پێویستە دەست بۆ حاڵیقەتێکی تریش ڕابکێشین. سەبارەت بەوەی لەو سەردەمەدا ئامرازەکانی بەرهەم هێنان ساکارو سادە بوون. دەبینین بەرهەمە زانستی و تەکنیکییەکان بەمستی پەرەیان دەسەندو گەشەیان دەکرد، چونکە کاتێکی زۆرو تاقی کردنەوەی زۆرتریان دەویست. ئەمە لەکاتێکا کرۆکی ڕێبازە فکرییەکانی ڕۆژگاری ڕێنیسانس لەبەرهەمی ئەو نووسەرو هونەرمەندە بەهرەدارانەدا ڕەنگیان دەدایەوە کە بەراستی خاوەنی هەستی ناسک و گیانی داهێنان بوون. لەلایەکی تریشەوە ئیتالیا ناوبانگی بەوە دەرکردووە کە سروشتێکی ڕازاوەی هەیە. ئەمەیش وای کردووە زمان و ئەدەبیاتی بەپێزتر بکاو سەرچاوەی داهێنان لە بوارەکانی هونەرو ئەدەبدا بەقێنێتەوەو بنچینەیەکی نوێی بۆ چێژ لێ وەرگرتنی ئەم بەرهەمە جۆر بەجۆرانە دابمەزرێنێ.

هەر لەو سەردەمەدا گەر شاعیرێکی میللی ئیتالیایی خواست و ئاواتەکانی لەبۆتەی شیعرێکی نوێدا بتواندایەتەوەو بی ویستایە بەجەماوەری ڕابگەیەنێ، چی کاسبکاری ئاوبازار هەبوو دەرگاو دووکانیان دەپێچایەوەو بەپەرۆشەوە ڕوویان تێ دەکردو گوێیان بۆ شیعرەکەی ڕادەمێنشت.

ئەنجامی کارکردنی ئەم هۆیانە، ڕێنیسانس لە ئیتالیادا پێش ووڵاتانی تر خۆی تواندو هەڵ و مەرجی گەشەکردنی بۆرەخسا. توانی خزمەتێکی ئەوتۆی بکا ڕەگەزە بنچینەیییەکانی نەش و نما کردنی بەجۆرێک پێ ببەخشێ کە لەوروژەو توانای هیچ ووڵاتێکی تری ئەورووپاییدا نەبوو. جا هەرچەندە ئیتالیا بەهۆی دەست تێوەردانی بێگانەو دۆزینەوەی ڕێگای دەریایی نوێوە توشستی هێنا، بەڵام سەرەڕای ئەم تێک شکاندنەیش ماوەی نەدا ئەوڕژمی بەتینی ڕێنیسانس لە ئیتالیادا ڕابگرێ. بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستی یەیش ئەوەندە بەسە بڵێین: کەڵە پیاوانی وەک "لیۆناردۆ دافینشی" و "میکائیل ئەنجیلۆ" و "ڕۆفائیل" و هەندێکی تریش هاوچەرخی ئەو توشستی یە بوون و لەو ساڵانەداو لەسایەی بارو ڕوفێکی لێجگار ئالەباردا- کە دوایی باسیان دەکەین- بەرهەمی ئەوەندە ناوازەیان هێنایە گۆڕێ، هەتا هەتایە بەنەمریی دەمێننەوە. ئەم واقیعە واتە دەرکەوتن و گەشە کردنی ڕێنیسانس لە ئیتالیادا وای لە هەندێ مێژوو نووس کردووە بکەنە ئەو باوەڕەی کە بووژاندنەوە تەنها ئەو ووڵاتەی گرتۆتەوە، ئەگەرچی ئەم لێک دانەوەیە کەمێک زێدەڕۆیی تێدایە: بەڵام کار تێ کردنی بیروباوەڕی ئیتالیای ڕۆژگاری ڕێنیسانس لە ووڵاتانی تر مەسەلەیەکە هیچ کەسێک ناتوانێ تکووڵی لێ بکا. هەرچۆنێک بێ پەیوەندیی لە پچڕان نەهاتووی ڕێنیسانس بە ووڵاتی ئیتالیاوە دەیکاتە نموونەیەکی وا، دەتوانین لەڕێگەیەوە بە گشتی ی سەردەمەکەی بەسەر ئەم سێ قۆناغەدا دابەش بکەین:

قۆناغی یەکەم: لەدوادوای سەدەی چواردەهەمەوە دەست پێ دەکا بۆ سەرەتای سەدەی پانزەهەم.

قۆناغی دووەم: واتە قۆناغی پێگەیشتن و نەش و نما کردنی کە دەکاتە کۆتایی سەدەی پانزەهەم و سەرەتای سەدەی شانزەهەم.

قۆناغی سێیەم: واتە سەرانسەری سەدەی شانزەهەم

هەر ئەم دابەش کردنە بەهەمان شێوە دەتوانرێ بەسەر ووڵاتەکانی دیکەی ئەورووپادا بچەسپێنرێ.

قۆناغی یەکەم، واتە ئەو قۆناغەی ڕێنیسانسی تێدا لەدایک بوو. لە دووهەمیشدا پێ گەیشت و بەخۆیدا هات. بەڵام لەسێهەمدا مرۆڤایەتی و بیروباوەڕی ڕێنیسانس دووچاری گیروگرفتێکی ڕاستەقینە بوو، وەک لەپاشدا بەدرێژیی لێی ئەدوێین. هەر یەکێکیش لەم سێ قۆناغەی بووژاندنەوە چەندین خاسییەتی بنچینەییان پێکەوە ئاوەو هەریەکێکیش لەو خاسییەتانە یەم یان بەو شێوە جیاوازییان لەتەک قۆناغی پێشووی خۆی، یان قۆناغی دوای خۆیاندا هەبوو.

## خاسیەتەکانی ڕێنیسانس:

ڕۆژگاری ڕێنیسانس و بزووتنەوەی مرۆڤایەتی چەند خاسییەتێکی ئەوەندە دیاریان هەیە. توانییان سەرانسەری ڕێنیسانس بکاتە شۆڕشێکی فیکریی و ڕۆشنبیریی ئەوتۆ مۆرکێکی تایبەتی بە مێژووی مرۆڤایەتییەوە بنێ. لێرەیش بەدواوە هەوڵ دەدەین گرنگترین لایەنی ئەو خاسییەتانە بەکورتی دەست نیشان بکەین:

1- لەبەر ئەوەی لەدایک بوونی ڕۆژگاری ڕێنیسانس ڕاستەو خۆ بەسترابوو بەپەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە، دەبینین لەیەک کاتدا هەموو ووڵاتە ئەوروپایی یەکانی نەگرتەوە. ئیتالیاو چەند ووڵاتێکی تری ڕۆژئاوا پێش ووڵاتانی تر کەوتن، بەڕادەیەک تەنها چەند پریشکێکی گەیشتە ئەوروپای ڕۆژهەڵات و ناوچەکانی "بولکان" کە لەو سەردەمەدا کەوتبوونە ژێر دەستی عوسمانلی داگیرکەرەوە. بەڵام سەرەڕای ئەمەیش ئەو ووڵاتانە توانییان مەرجەکانی ڕێنیسانس بەهۆی داهێنانی زانایانیانەوە بەهێزتر بکەن، باشترین نموونەیش ئەوەیە کە زانایەکی بەناوبانگی وەک "کۆپەر نیکۆس" کە هاوولاتییەکی پۆلۆنیاییە لەم بۆچوونە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ڕێنیسانس. دەستکەوتی ڕۆشنبیریی سەرجەم ئەو میللەتە ئەوروپایی یانەیە کە لەبەر ڕۆشنایی بارووزرووفی تایبەتی و ناوخۆیی خۆیاندا، ئەوریان لەگەشەپێ کردنیدا دیوە. جا گەر بێ و ڕادەی کارتێ کردنی شارستانیەتی ڕۆژهەڵات بەراستی لەبەر چاوبگرین، ئەوا ڕێنیسانس

لەچوارچێوە گشتی یەکەیدا دەبێتە دەستکەوتێکی رۆشنبیریی تێکڕای مرۆڤایەتی، راستی یەکەیشی هەروایە، چونکە حەقیقەتی رێنیسانس ئەنجامی مەنتیقی ی ئاوێتە بوونی بەردەوامی شارستانی یەتە جۆربەجۆرەکانەو ئەوداکەیشی چ لەڕووی کارکردن و چ لەرووی کار تێکردنەوە گەلێك لە رێنیسانس بەر بڵاوترو فراوانترە.

مایەی داخە، سەرەڕای ئەم حەقیقەتە چەسپاوە رۆژئاوایی یەکان خۆیشیان دان بەوەدا دەنێن کەرێنیسانس قەرزداری رۆژهەڵاتی یەکانە- کەچی کەم و زۆر لەنووسینەکانیاندا رەنگ ئاداتەوەو بەوچاوەوە تێ ی ئاڕوانن کە بەرهەمی رەنج و تەقەللای هاوبەشی گەلانی دونیایە. ئەوەیشی کە زیاتر پاڵپشتی ئەم

رایەمان دەگرێ ئەوەیە، لەڕەوتی گەشەکردنی شارستانیەتدا پرشنگی رێنیسانس بەتەنها بەشێك یان هەموو کیشوەری ئەورووپای رووناك نەکردەوە، بەڵکو هێزو گورێکی ئەوتۆی بەخۆیەوە دی، بەشێوەی جۆربەجۆر خۆی گەیاندە بست بەبستی سەر رووی زەمین و ژاتایانی بەپێ ی پێداویست و بارو زرووف و قۆناغە مێژوویی یەکەی

خۆیان، بەشداری یان لە پێشخستن و گەشە پێ کردنی دەستەکەوتەکانیاندا دەکرد.

2- گوڕو گوڕمی رێنیسانس و چۆنیەتی پەرەسەندنی راستەوخۆ بەسترابوو بە رادەی گەشەکردنی پەیوەندی و دیاردە ئابووری و کۆمەڵایەتی یە تازەکانی وڵاتە ئەورووپایی یەکانەوە. بەنموونە: رێنیسانس لە ئینگلستاندا لەسەدەی چواردەهەمدا سەری هەڵدا. بەڵام تیژ بوونی ناکۆکی و ململانێ ی نێو دەرەبەگایەتی لەو وڵاتەدا بووە هۆی هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆیی و لەسەدەی پانزەهەمدا کۆسپێکی ئەوەندە ئالەباری خستە بەردەم پەرەسەندنی ئینگلستان، دیاردەکانی رێنیسانس تاسەرەتای سەدەی شانزەهەم دەرنەکەوتن، واتە ئەو کاتەی سەرەتای چوونە پێشەوەو گەشە کردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە ئینگلستان بەشێوەیەکی دیار هەستیان پێ دەکرا.

لە "ئیسپانیا" یشدا گەندەڵ بوونی خێرای لایەنە جۆربەجۆرەکانی ژیانی گەلی ئیسپانیا ماوەیان تەدا دیاردەکانی رێنیسانس بەو خێرایی یە تەشەنە بکەن وەك لەسەرەتادا لەوێ سەریان هەڵدا.

پوختەی قسە ئەوەیە، لەدایك بوون و پاشان پەرەسەندنی رێنیسانس، لەسەر هێڵێکی دیاری کراو نەدەڕۆیشتن، بەڵکو بە پێ ی ئەو بارودۆخە خۆی دەنواند کە هەر وڵاتە پێیداتێپەڕ دەبوو. رێنیسانسیش دەستکەوتی رەنج و کۆششی ئەورووپایە لە چوارچێوە تەسکەکەیداو هی هەموو جیهانە لەچوارچێوە فراوانەکەیدا.

3- هەرچەندە رەگەزێکی هاوبەش هەموو دیاردەکانی رێنیسانسی لەسەر پاکی وڵاتە ئەورووپایییە جیاجیاکاندا بەیەکترەوە گرێ دا، بەڵام هەر وڵاتە بەهۆی بارو زرووفی خۆیەوە پێویستی بەوە ئەکرد پێ لەسەر دیاردەیەکی تایبەتی دابگرێ و سیماو خاسیەتی خۆی بپارێزێ. بەنموونە: لە "ئەڵمانیا"دا هۆمانیستان دەستیان دایە ئەو لێکۆڵینەوانەی (ئارامس- ئیرازموێ) بە "فەلسەفەی عیسا" ناویان دەبا.

لەم روانگەیەوە رێنیسانس لە "ئەڵمانیا"دا چووە قاڵبێکی قووڵی فیکری یەوەو راستەوخۆ لە مەسەلەکانی کڵێسەی کاتۆلیکی یان دەکۆڵی یەوە. ئەوە بوو لەدواییدا کاری لەبزووتنەوەی رۆیفۆرمی





ئاینیش کرد، بەلام فەرەنسایی یەکان بەتایبەتی روویان کردە لێکۆڵینەوەی یاسای رۆمانیی کۆن، ئەمەیش بۆ ئەوکاتە دەست پێشخەری یەکی گرنگ بوو، ئەنجامیش زەمینەیەکی لەباری بۆ گەشەکردنی لێکۆڵینەوەی یاسایی لەفەرەنسادا رەخساند. کەچی بیروباوەری رێنیسانس لە ئینگلستاندا لە زەمینەی فەلسەفەو ئیستاتیکادا رەگی داکوتاو بەئاشکرا لەبواری ئەدەب و سۆسیولۆژیاو شانۆدا تەعبیری لەخۆی دەکرد. وەنەبێ ئەو بەرهەمە ئەدەبی یانەیش سیما ئاینی یەکەیان وون کردبێ؛ بەتایبەتی لەسەردەمی شەری جووتە گوڵدا، چونکە هەر لەو کاتەدا شان بەشانی ئەم چەشنە بەرهەمانە، چەندین رۆمانی نوێ لەدایك بوون و بەهەمان شێوازی پێشوو بەشان و شکۆی سوارچاکی ی و پاڵەوانێتیدا هەڵیان دەدا. چەند وولاتی وایش هەبوون تێیاندا فیکری رادیکالی بەهێزتر تەعبیری لەخۆی دەرکرد وەك لەهەندێ وولاتی دیکە. بەلام سەرەرای ئەم جیاوازی یانەیش لێکچوون و نزیکیان لەیەکترەوە، بەهەر بارێکدا لێك بدرێتەوە ئەوە دەگەیەنێ کە کەلتووری رۆژگاری رێنیسانس لەسەرپاکی کیشوەری ئەوروپاداسەروەرو باڵادەست بووە.

4- پیاوانی رۆژگاری رێنیسانس بەتایبەتی لە ئیتالیادا تەنها لەبوارێکدا پسپۆر نەبوون. زۆر جار رێکەوتووە یەکێك لەوانە چمکی چەند لایەنی جۆر بەجۆری زانستی و هونەری گرتووەتە دەست، باشترین نموونەیش نیگارکێشی ئەمر لیوناردۆ داڤینشی یە.

ناوبراو پەیکەر تاشێکی شارەزاو نووسەرێکی دیارو ئەندازیارێکی سەرکەوتوو، زانایەکی پزیشکی ی ویەکالا کردنەوە التشریح-ی جەستەی ئادەمیزاد بوو. زانیاری پزیشکی ی و یاسایی و فەلەکی لەوڵاتی خۆی و ئیتالیا خوێند. لەوڵاتەکەی خۆیدا بەدرێژایی "40" ساڵ بەردەوام بە تاقیکردنەوە زانستی یەکانەوە خەریك بوو. پێ بەپێ ی ئەوەیش لەبواری دارایی و ئیداریپیدا کاری دەکرد. بیروراو بۆ چوونەکانی دەیخەنە ریزی زانایانی سەردەمەکەیەوە. "ماکیافیللی"یش هەر لەوکاتەداکەمێژوو نووس و سیاسی یەکی بەناوبانگ بوو، یەکێکە لەنووسەرو فەیلەسووفەکانی سەردەمەکەی بۆ زیاتر دەست خستنە سەر ئەم دیاردەیە، لەو بەشەدا کە بۆ ئاودارانی رێنیسانسمان تەرخان کردووە، لەچەند نموونەیەکی تریش دەدوێین.

5- لە قۆناغی یەکەمدا پێشەوایانی رێنیسانس بایەخێکی زۆریان بە بەرهەمە فیکری یەکانی پێش قۆناغی دەرەبەگایەتی دا. واتە بەرهەمی ئەو چەرخەی تێدا زانایان تەرقی بە کاثولیکی بوون نەخرابووە گەردنیان. ئەوانە لەهەمو شت زیاتر بایەخیان بە ژیان و ئادەمیزاد دەدا. باوەرێکی نەگۆریان هەبوو بەوەی کە دەتوانن لەپاش دەیان و سەدان ساڵەی زوڵم و ستەمی سەدەکانی ناوەراست بگەرێنەوە سەر رێبازەکەی خۆیان و ئاور لەژیانی راستەقینە بدەنەوەو هەوڵی تێگەیشتنی سروشت بدەن و تەعبیری لێ بکەن و لەرێگەی ژیاندنەوەی کەلەپوری کۆنەوە سوود وەربگرن. هەوڵ و کۆششی ئەمانە بەدرێژایی سەدەی چواردەهەم و پانزەهەم لەپێناوی ژیاندنەوەی کەلەپووری کۆندا گەیشتە رادەیەك خەڵکی لایان وابوو دیاردەکانی بووژاندنەوە تەنها بریتی یە لە زیندوو کردنەوەی ئەو زانستانەی لەسەردەمی گریك و رۆماندا باو بوون. بەجۆرێکی تر بڵێین: خەڵکی هەستیان بەوە نە دەکرد کە سەرهەڵدانی ئەو دیاردە نوێ یانە ئەنجامێکی سروشتی ی ئەو پێداویستە کۆمەڵایەتی یە تازانە بوو کە بەچەند قۆناغێك سنووری کۆمەڵی کۆنیان بەجێ هێشتبوو. ناوەرۆکیشیان بریتی بوو لەو داهێنان و دۆزراوە نوێ یانەی لەسەدەکانی پێشوودا نەك هەر بیریان لێ نەدەکرایەوە بەڵکو پێویستیشیان پێیان نەبوو. کەواتە هۆیەکانی رێنسانس وەك پێشتر باسیان لێوە کرا بەجۆرێك لەکۆمەڵدا رەگیان داکوتابوو، لەوە دەرچووبوون بەتەنها بریتی بن لە بووژاندنەوەی کەلەپوری کۆن. یاخود ئەنجامی هەرەس هێنانی "قوستەنتەنی یە" و پەرێنەوەی "بیزەنتی یەکان" و دەستنووسە گرێکی یەکان بوو بێ بۆ ئیتالیا، وەك ژمارەیەکی زۆر لە مێژوونووسان پێ ی لەسەر دادەگرن. نەخێر، راستی یەکەی ئەوەیە "ئەوروپا بەئاگا هاتبوودەوە بەپەرۆشەوە هەڵپەی بۆ زانست و



زانیاری نوێ بوو، ناچار بوو بۆ گەیشتن بەم مەبەستە پیرۆزە لەهەموو لایەنێکەوە پەل و پۆ بهاوێژێ. بۆیە رۆڵەکانی کەوتن بەسەر لێکۆڵینەوەی "لایەنە پشت گوێ خراوەکانی گەنجینەی کلاسیزم کە تا ئەو کاتە لەبیر کرابوون". لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە رێنیسانس "قۆناغێکە لە قۆناغەکانی گەشەکردنی بیر نەک وێنەیەکی کتومتی رابوردوو، وەک لەبابەتەکانی داهاتوودا روون دەبێتەوە.

6-هەموو ئەو داهێنانە نوێیانەی رۆژگاری رێنیسانس، خزمەتی زانست و تەکنیکی تازەیان دەکردو پەیوەندییەکی بەتینیان بە بەرژەوەندییەکانی چینی بۆرژواوە هەبووە. ئەمەیش بە ئاشکرا لەو گۆڕانکارییانەدا بەرجەستە دەبێ کە لەمەیدانی کەشتی دروست کردن و پێشکەوتنی لێکۆڵینەوەی جوگرافیایی و ئەستێرەناسیدا بەدی دەکران. چونکە بەبێ ئەو پێشکەوتنە مەحاڵ بوو رێگای تازەی بازرگانیی لە نێوان جیهانی کۆن و بەری رۆژئاوای سەرزەمیندا بدۆزرێتەوە.

هەر لەم قۆناغەدا، بڵاوکراوەی جوگرافیایی هەمەجۆر دەردەچوون و ناوەرۆکیان پڕ بوو لە زانیاری کۆمەڵایەتی و زانستیی خۆش و گرنگ؛ بەرادەیەک نەک هەر سەرنجی گەڕیدەو گەڕۆکەکانیان رادەکێشا بگرە خوێنەری ئاساییش تامەزرۆی خوێندنەوە یان بوو. هەروەها بایەخ بە ماتماتیک و رووەک ناسیی و چەند زانیارییەکی تری سروشتی دراو هەریەکەیان بەپێی پێداویستییەکانی کۆمەڵی نوێ بەشدارییان لەگەشە پێکردنی ژیانی ئابوری وڵاتە ئەوروپاییەکاندا دەکرد. ئەم بایەخ دانەیش بە زانیارییە سروشتییەکان، بنچینەی ئایدیۆلۆژیای چینی بۆرژوای تازە پێگەیشتووی پتەوتر کردو لەسەر بناغەی تاقیکردنەوە، زوربەی هەرە زۆری بیروباوەڕی دەرەبەگایەتی پووچەڵ کردەوە، کە لەماوەی چەند سەدەیەکدا باڵی بەسەر کۆمەڵگای ئەوروپاییدا کێشابوو.

7-لەبەر ئەوەی هومانیستانی رۆژگاری رێنسانس بەوردی بناغەیان بۆ تەلاری رۆشنبیریی نوێی دونیایی دانا، دەتوانرێ هەر ئەوانە بەبنیاتنەری ئایدیۆلۆژیای چینی بۆرژوا لەقەڵەم بدرێن. سەرەتای دەرکەوتنی زاراوەی هومانیزم و هومانیست Humanism Humanistic وەک دەربڕینێکی فیکریی و کۆمەڵایەتی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شانزەهەم. ئەم زاراوەیە لەبنەڕەتدا لەووشەی Humanitasی لاتینییەوە، وەرگیراوە کەمانای مرۆڤایەتی دەگەیەنێ. ئەمەی دواییش لەووشەی Homo وە وەرگیراوە کەمانای ئادەمیزاد دەبەخشێ. پابەرانی ئەم رێبازە نوێیە مەبەستیان لەهەڵبژاردنی ئەم زاراوەیە ئەوە بوو پێ لەسەر سیما دونیایییەکەی زانست و ئەدەب دابگرن و بایەخ بەئادەمیزاد بدەن، چونکە بەدرێژایی چەند سەدەیەک و بەتایبەتی لەو کاتەوە کە نەقابەو رێکخراوە پیشەییە جۆربەجۆرەکان وەک تەوقێک لەگەردنی ئادەمیزاد ئاڵابوون. کەوابوو دیارترین خاسییەتی هومانیزم ئەوەبوو پێی لەسەر خودی تاکەکەس دادەگرت Individualism Individual.

بێگومان ئەم هەڵوێستەیش هەروا لەخۆوە نەبوو، بەڵکو پێداویستەکانی ژیانی سەدەی نوێ گۆڕانێکی گەورەی بەسەر پلەوپایەی تاکەکەس و چۆنیەتی هەڵس و کەوتی لەناو کۆمەڵدا سەپاند.

لەسەدەکانی ناوەڕاستدا، دەرەبەگەکان بەحوکمی بنەماڵەو بەئەندازەی ئەو میراتەی بۆیان لەپاش بەجێ دەما، پلەوپایەی کۆمەڵایەتییان دەست نیشان دەکرا. لەم حاڵەدا ساماني دەرەبەگ بەرهەمی رەنج و تەقەللای خۆی نەبوو، بەڵام لەرۆژگاری رێنیسانسدا خێزان و خانەوادەی تاکەکەس بۆی نەبوو سنوور بۆ دەسەڵاتی توێژە کۆمەڵایەتییەکانی سەروو دابنێ و دەبوو سەرمایەدار- بەتایبەتی لەسەرەتای قۆناغی سەرمایەداریدا- کار بکاو لەمەیدانی ئابورییدا بکەوێتە دوای بەربەرەکانێ و سەنگ و سوکیی و بەوردیی ئاگای لەناڵ و گۆڕی بازاڕ هەبێ. دیارە هەرچی هەوڵێکیش بدا بۆ ئەوەیە وزەو توانای پەرەبسێنێ و ماوە نەدا لەگێژاوی بەربەرەکانێدا رای بماڵن. ئالەم تێڕوانینەوە زاناو رۆشنبیرانی رۆژگاری رێنیسانس بایەخیان بەنرخی تاکەکەس و خودی مرۆڤ دەداو ئادەمیزادیان کردە "پێوانەیەک بۆ هەموو ئەو شتانەی ئادەمیزاد بەرهەمی دەهێنێ" چونکە هەر ئەو دەزانێ "چی دەکاو چۆن بەهرەو توانای دەخاتە کار" تاوەکو "ئەوەندەی دەرفەتی بۆ دەرەخسێ سوود وەربگرێ و رێگاو جێگای خۆی لەم

جیهانـەدا بدۆزێتـەوە. لـەم تـێ روانینـەوە، هومانیسـتان تاکـە کەسیان کردە پارچەیەکی سروشت ورایان وابوو خاوەنی توانایـەکی لـەبن نـەهاتووەو بوونەوەرێکـە دەتوانێ "سەر بەهەموو دەرگایەکدا بکا" و مادام "تـۆوی چـەندین زانستی تێدایە، چی دەرگا هەیە لەبەردەمیدا ئاواڵەیە". هـەر لـەم بۆچوونـەوە هومانیسـتان پێیـان لەسـەر مەسـەلەکانی ژیـانی تاکەکـەس و چۆنیـەتی بـاری سـەرنجی بەرامبـەر بـەدیاردەکانی کۆمـەڵ دادەگـرت. شـان بەشـانی ئەمـەیش بایـەخیان بەهـەموو ئـەو کردارانە دەدا کە لەژیانیدا خۆشی و لەزەتی دونیای‌یانی بۆ دابین دەکـا. بەراندیـەک حـاڵ گەیشـتە ئـەوەی زۆربـەیان دەیـان ووت: مـەرجی بنچینەیی ئەوەیە خودی ئادەمیزاد بەختیاربێ، جا ئیتر بە چ رێگایـەک دەگاتە بەختیاریی، ئەوەیان گرنگ نی‌یـە. بەنموونـە: "لۆرێـنزۆ ڤـالا" بەکوڵ رای دەگەیاند کە ئامـانجی ژیان بەختیاری‌یەو پێویستە خەڵکی هەڵپەی بۆ بکەن، چونکە خواستی سروشـت خۆیـەتی. لێکدانـەوەو شـی‌کردنەوەی ئـەم چەشـنە بیروڕایانە، رێگای بۆ ئـەوە خـۆش کـرد خـەڵکی جاروبـار لەیاسـا مەعنەوی‌یـەکان دووربکەونـەوەو بۆپەروا خۆیان بەخۆشی و لەزەتی ژیانـەوە خـەریک بکـەن. ئـەم دیاردەیەیش بەزۆریی لەناو توێـژە دەست رۆیشتووەکاندا دەردەکەوت، بـەڵام لەگـەڵ هـەموو ئەمانەیشـدا دەبێ ئەو حەقیقەتە لـەیاد نەکـەین هومانیستان مەبەستیان لـەو رایـە ئـەوە بوو، تاکە کـەس لەکۆمـەڵدا جێگای شیاوی خۆی بدرێتێ. کـە دەیان ووت: پێویستە دڵبەستەی یاساکانی رابوردوو بێن، مەبەستیان ئەوەنەبوو بەتەنها تاکەکەس بکەنە "پیـاوێکی رۆشـنبیر"، بـەڵکو گـەرەکیان بـوو بیکەنـە "هاوڵاتی‌یـەکی باشـترو سوودبەخشتر". بێگومان ئەم بۆ چوونـەیش تـەعبیری لـە هەڵوێسـتێکی ئـەخلاقیی گرنـگ دەکردو دەبێ لەروانگەی گشتی‌ی کۆمەڵایـەتی‌و ئیشـتمانی‌یەوە تەماشا بکرێ[34]. بەهـەر حـاڵ پوختـەی بیروڕای هومانیسـتان سەبارەت بەژیانی ئادەمیزاد تەواو بەپێچەوانەی بیروباوەڕی کڵێسـەوە بوو، کە دەیویست هـەرچی شـتی دونیایی هەیە بۆ خزمەتی قیامـەت تـەرخان بکرێ! دیـارە ئەمـەیش شتێکی نوێ بوو یاسـای کڵێسـەو پیـاوە ئاینی‌یـەکان خسـتبوویانە کـارو زۆر دوور بـوو لەجەوهـەری ئاینی‌مەسیحی‌یەوە. بزووتنـەوەی ریفۆرمی ئـاینیش بەشێوەیەک ئەم حەقیقەتـەی سـەلماند، مـاوەی بـۆ مشـت و مـڕو قسـە لەسـەر کـردن نەهێشتەوە. دەبێ ئەو راستی‌یەیش بووتـرێ کـە شـێوەی هـەڵس و کەوت و ژیانی رۆژانەی پاپاو پیاوە ئاینی‌یـەکان تـەواو بەپێچەوانـەی فەرمایشـتەکانی خۆیانـەوە بـوو، لەبەر ئەوە هەڵوێستی هیچ ترخێک بۆ ژیانی ئـادەمیزاد نەهێڵێتـەوە. لەهەمان کاتیشدا دەیانویست لـە ئـادەمیزادو دەوروبەرەکـەی بوون. لەبـەر ئـەوە کەدێینـە سـەر هەڵسـەنگاندنی دیاردەکـانی رینیسانس هەست بەجۆرە ئاکۆکی وجیاوازی‌یەک دەکەین، بە تایبەتی لەناو ئەو رێبازە فیکری‌یانـەدا کە لـەو سـەردەمەدا هاتنـە گـۆڕێ، لەسـەدەی شـانزدەهەمدا ووڵاتـە ئەورووپایی‌یـەکان بەگشـتی‌ی، لەرووی پێشکەوتن و پەرەسەندنەوە لەئاستێکدا نەبوون بتوانن پرشنگی رێنیسـانس وەک یـەک بقۆزنـەوە، دەبینیـن لـەوڵاتانی بولکـان و ئـەورووپای رۆژهـەڵاتدا سـستتر تەشەنەی کردو کـەمتر هەسـت بـەکارتێ کردنـی دەکـرێ. کـەچی لەشـوێنێکی وەک ئینگلسـتان و فەرەنسـاو خـوارووی ئـەورووپادا زیـاتر بڵاوبـووەوە. پێویسـتە ئاگاداری ئەوەیش بین کە ئاسەواری رێنیسانس بەشێوەی جۆربەجۆر لە ئیتالیاوە پەڕی‌یەوە بۆ ووڵاتانی تر. هێرشی سووپایی فەرەنسا بۆ سەر ئیتالیا دەورێکی کاریگەری بینی و بەهۆیـەوە میسـرو شـازادە فەرەنسایی‌یەکان شارەزای شێوەی ژیـان و کـەلتووری دانیشـتووانی ئیتالیـای پێشـکەوتوو بـوون. تەنانەت لەوانـەوە شێوازی جل و بـەرگی نـوێ‌و هـەڵس و کـەوتی کۆمەڵایـەتی فێر بـوون. زۆریشـی نەخایاند دەرباری فەرەنسا بـووە بنکەیەک و چی دیاردەی رێنیسانس هەبوو لە ئیتالیادا قۆستیانەوەو لای خۆیانەوە پەرەیان پێدا. بەنموونە کۆشکی پاشایەتی لە "پاریس" کە بە "لۆڤەر" ناسراوەو ئانیستاش لـەریزی پێشـەوەی مـەزارە فیکری‌یـەکانی جیـهان دادەنـرێ بەرهـەمی ئـەو تێکـەڵ بوونەیـە. قوتابیانیش لەم مەیدانەدا دەورێکی باڵایان بینی‌و لەرێگای ئەوانەوە زۆر لایـەنی سـەرەتایی رێنیسانسـی ئیتالیا گەیشتە ووڵاتانی دیکـەی ئەورووپا. هـەر لەساڵەکانی دوایـی سـەدەی چواردەهەمـەوە شـاری "فلۆرەنسا" لەسەر شێوازێکی نوێ دەستی دایە لێکۆڵینەوەی زمـانی گرێکی‌ی کۆن و ئـەنجام لەهـەموو بەشەکانی تری ووڵاتدا بـەخێرایی بڵاو بووەوە. بەسەرێکی فێربوونی زمان و شارەزابوونی بەرهەمـەکانی "ئـەفلاتون" و "ئەرسـتۆ" وفەیلەسـووفەکانی‌تر، خۆیـان گەیاندە شارەکانی ئیتالیا ئەمانـە کە دەگەڕانەوە تۆوی بیروباوەڕی نوێیان بۆ ئیشتمان دەبردەوەو ئـەنجام بـەروبومێکی تـازە پشـکوتویان لێ هێنایـە بەرهـەم. هـەرچۆنێک بێ، سێ قۆناغەکـەی رۆژگاری رێنیسانس چ لە ئیتالیاو چ لەووڵاتانی دراوسـێیدا، بوونـە هـۆی ئـەوەی چـەند ئـەنجامێکی تایبەتی‌ی گرنگ بەدەستەوە بدەن و پاشـان کـار لەگەشـەکردنی بیروزانستی سەرانسەری جیهانیش بکەن.

بێگومـان لەتوانایشـدا هەیـە خاسی‌یەتەکانی رێنیسانس بەهۆی دەرخسـتنی ئەنجامـە بنچینەیەکانی‌یەوە زیـاتر و روونتر بەرجەستەبکەین، بەتایبەتی چونکە هەردوو ئەو لایەنانـە تـا رادەیـەکی زۆر لەیەکتر ئاڵاون

تێبگەن، ئەمـەیش خـۆی لـەخۆیدا بـووە داینەمۆیـەک و زانسـت و زانیاریی تازەی خستە گەڕو پێشی خستن.

8- بەشـی هـەرە زۆری ئـەو بیروڕایانـەی لەتـەک رێنیسانسـدا هاتنە کایەوە کاکڵەی ئایدیۆلۆژیای چینی بۆرژوایان پێک دەهێنا. بەڵام هـەندێ لایـەنی دیکـەی ئـەو بیروڕایانـە لـەچوارچێوەی ئایدیۆلۆژیای ئـەو چینـە تـازە پێ گەیشتووە چوونە دەرەوەو بەم یان بەو شێوە تـەعبیریان لەخواست و ئاواتی توێژە کۆمەڵایەتی‌یە هەژارو نەدارەکان دەکرد، بەتایبەتی چینی کرێکـاران. هـەندێکی تریشـیان لەئەنجامی ئەو هۆیانەدا کە پاسمان کـردن رەنگدانـەوەی بـیری دەرەبەگایـەتی‌و پیـاوانی کڵێسـە سـەرەڕای ئەمـەیش رێنیسـانس بەگشـتی‌ی بـەرژەوەندی چینـی بـۆرژوای تازەپێ‌گەیشـتووی دەربڕیوە. ئەمە لەلایەک، لەلایـەکی تریشەوە، چونکە لە بنچینەوە دژ بەدەرەبەگایـەتی بـوو، بـەرگێکی شۆڕشگێڕانەی لەبەر هەڵکشابوو، تەعبیری لە ئاوات و ئامانجی هەموو ئـەو چین و توێژانـە دەکـرد کـە بـەرژەوەندیی بنچینـەیی‌یان لەوەدادەبینی‌یـەوە، گۆڕانێکـی بنەڕەتی‌ی لەکۆمەڵدا بەرپابێ.

خاسـی‌یەت و پێداویسـتەکانی رێنسـانس یەکەمجار لە ئیتالیـادا دەرکەوتن و پاشان لەوڵاتانی دیکەی ئـەورووپادا بڵاوبوونـەوەو بـەپێی باروزرووفی ناوخۆی هـەر ووڵاتـە خۆیـان دەگونجـان و گەشـەیان دەکـرد. جـا سـەبارەت بـەوەی

АКАДЕМИЯ НАУК АЗЕРБАЙДЖАНСКОЙ ССР

ИНСТИТУТ НАРОДОВ БЛИЖНЕГО И СРЕДНЕГО ВОСТОКА

М. А. КАМАЛЬ

# НАЦИОНАЛЬНО-ОСВОБОДИТЕЛЬНОЕ ДВИЖЕНИЕ В ИРАКСКОМ КУРДИСТАНЕ (1918—1932 гг.)

ИЗДАТЕЛЬСТВО АКАДЕМИИ НАУК АЗЕРБАЙДЖАНСКОЙ ССР

Баку — 1967



# پڕۆژەی
# بەرگری لە سلێمانی

دوای ڕاپەڕینە بەناوبانگەکەی شاری سلێمانی لە ڕۆژی شەشی ئەیلولی ساڵی 1930 دا شێخ محمود هاتەوە مەیدان و دەستی لەو ڕێککەوتننامەیە هەڵگرت کە بە ناچاری سەرەتای حوزەیرانی ساڵی 1927 لەگەڵ میریدا بە سەرپەرشتی ئینگلیزەکان مۆری کردبوو. لەماوەی ئەو سێ ساڵ و چەند مانگەدا شێخ گوندی پیرانی ئەودیو سنووری کردە بارەگا و خۆی لە کاروباری ئەودیو دوورە پەرێز گرت.

کوشتاری شەشی ئەیلول هەستی هەموانی بزواند، دەیان بروسکەی نارەزایی کورد گەیشتە بارەگای "کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبة الامم) لە جنێف. تەنانەت دانیشتوانی مەریوانی ئەودیویش بە بروسکە داوای ئازادکردنی ئەو نیشتمانپەروەرانەیان کرد کە لە سلێمانی گیران و برانە کەرکوک.

هەڵبەت شێخ مەحمودیش نەیدەتوانی دەستەوەستان دانیشێ ئەویش یەکسەر کەوتەخۆ. هەر زوو شێخ سەلامی شاعیری بە نهێنی ناردە بەغدا تا دەنگ و نیازی بگەیەنێتە ئەو ئەفسەرە کوردانەی پشتی پێ دەبەستن، ژمارەیەکیان هەڵهاتن و دایانە پاڵ شێخ و کەوتنە کەڵاڵە کردنی هێزەکانی بۆ ڕاپەڕینی داهاتوو. بەر لە کۆتایی ساڵی 1930 شێخ هاتەوە ئەودیوو بە نامەیەکی تایبەتی داوای لە نوێنەری باڵای بەریتانی ( المندوب السامی البريطاني ) کرد گشت داخوازییەکانی کورد جێبەجێ بکەن و گیراوەکان ئازاد بکەن. وەڵامی نوێنەری باڵا بۆمبارانی ناوچەکە بوو، دیسان فڕۆکە جەنگییەکانی ئینگلیز بەربوونەوە گیانی کورد. بەڵام ئاگری شۆڕش زۆر ناوچەی گرتەوە و گەیشتە ناو جەرگەی هورین و شێخانیش. ئەمە



SULAIMANIYAH





اعلان رسمي

بۆ ئینگلیز دەستی نەدەدا، خەریك بوو ڕیسەکەیان ببێتەوە خوری و هەموو ئەو کۆششەی لە بستەکاندا دایان بۆ پەلوپۆخستنی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد بەفیڕۆ بچێت. ڕۆژنامەو گۆڤارە ئینگلیزی‌یەکانی وەك "تایمس" و"ئیرنیست ئێند ئیندیا" ( ڕۆژهەڵاتی نزیك و هندستان ) کەوتنە باسی ئەو مەترسی‌یە.

ڕاپەڕینی ئەمجارەی کورد وا تەشەنەی سەند شێخ مەحمود دیسان زاتی ئەوە بکات بەرەو کەرکوك و دەوروبەری بکشێ تا ڕۆژی پێنجی نیسانی ساڵی 1931 شەڕی ئاوباریك لە ناوچەیەکدا قەوما کە تەنها بیست میل لە دوز خورماتووە دوورە. لەو شەڕەدا بۆمبا هاوێژەکانی ئینگلیز شێخ مەحمودیان وەخەبەر هێنا و خەونەکانیان پووچەڵ کردەوە. ئینگلیزەکان ماوەیەکی چاك بە دارشتنی ئەو پیلانەوە خەریك بوون.

وادیارە لەو ماوەیەدا ئینگلیزەکان و کاربەدەستانی ڕژێمی پاشایی ئەوسا ترسی ئەوەیان لێ نیشتبوو کە شۆڕشگێڕانی کورد شاری سلێمانی ئازاد بکەن، بۆیەکا نەخشەیەکی بەر فراوانی تایبەتی یان بۆ بەرگری کردن لەو شارە دارشت. دەقی ئەو نەخشەیە برمتی‌یە لە ڕاپۆرتێکی دوورودرێژ کەوا دیارە ئەفسەرانی ئینگلیز تەواو بە داناني‌یەوە ماندوو بوون و دوای تەواو کردنی ڕۆژی بیست و هەشتی شوباتی ساڵی 1931 چاپیان کردووە و ناویان لێ ناوە "پرۆژەی بەرگری لە سلێمانی"

دەقی ڕاپۆرتەکە بە زمانی ئینگلیزی بریتی‌یە لە چوارنە لاپەڕەی قەوارە گەورە، ڕێرای حەوت پاشکۆکە ئەوانیش بەسەر یەکەوە بریتین لە هەشت لاپەڕەی تر، جگە لە دوو نەخشەی شاری سلێمانی، کە هەموویان بەسەر یەکەوە دەکەنە بیست و چوار لاپەڕە.

حەوت دانە لە ڕاپۆرتی "پرۆژەی بەرگری لە سلێمانی" و پاشکۆ و نەخشەکانی چاپ کراوەو بەسەر دەزگا بەرزەکانی میریدا دابەش کراون کە یەکێکیان وەزارەتی کاروباری ناوخۆیەو من لەناو فایلە تایبەتی‌یەکانی ئەو وەزارەتەدا دەقی پرۆژەکەم دۆزی‌یەوە. هەروەها وێنەیەکیشی لێ دراوەتە بنکەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە هنێدی کە ئێستە ناوی بۆتە ( معسكر الرشيد ) لە بەغدا.

بەپێی زانیاری ناو ئەو ڕاپۆرتە ژمارەی دانیشتوانی شاری سلێمانی سەرەتای سی‌یەکان شازدە هەزار کەس بووە. ئەو خەمڵە دروست نایەتە بەرچاو، چونکە بەپێی یەکێك لەو ڕاپۆرتە بایەخدارانەی کە هەر ئینگلیزەکان خۆیان دەربارەی بەڕێوەبردنی عێراق داویانەتە "کۆمەڵەی نەتەوەکان" ساڵی 1924 ژمارەی دانیشتوانی ئەو شارە بەلایەنی کەمەوە بیست هەزار کەس بووە.

هەر چۆن بێ بایەخی زانیاری‌یەکانی ناو ڕاپۆرتەکە دەربارەی بارودۆخی سلێمانی لە سەرەتای سی‌یەکاندا زۆرە، بەشێکیشیان دەگمەنن. لەوانە زانیاری‌یەکە دەربارەی ژمارەی چەکی ناو شار کە، وەك دەڵێ، خۆی دەدا لە 500 پارچەو بەشی زۆری دەمانچە بووە. هەرچەندە ڕاپۆرتەکە ئەو ژمارەیە بە دروست دادەنێ، بەڵام دوورنی‌یە ژمارەی خاوەن چەك لەناو شاردا ئەوسا لەوە زۆرتر بوبێ، لەبەر باری ژیان لەو ساڵانەدا بازاڕی قاچاغی چەك لەناو شاردا گەرم بوو.

سەرەتای ڕاپۆرتی "پرۆژەی بەرگری لە سلێمانی" بۆ باسی ناڕەزایی زۆربەی دانیشتوانی شار تەرخان کراوە کە، وەك دەڵێ ((دوور نی‌یە هەر ئەوەندە دەرفەتیان بۆ هەڵبکەوێت ڕاپەڕن". بۆ لێکدانەوەی سەنگی ئەم قسەیە دەبێ کوشتارەکەی ڕۆژی شەشی ئەیلولی بەر نزیکەی شەش مانگ بهێنینەوە یاد کە دوژمن ویستی کوردی وا پێ تەمێ بکات جارێکی تر بیر لە ڕاپەڕین نەکاتەوە، بە داخەوە کەس دەرسی لەو پەندە گەورەیە وەرنەگرت.

هەمان کات دانەرانی "پرۆژەی بەرگری لەسلێمانی" بە دووری نابینن ئەگەر شار ڕاپەڕێت هەموو ناوچەکە بە دەنگی‌یەوە بچێت و "هەرایەکی گشتی" بەرپا بێت و لە ماوەیەکی کورتدا "چەند هەزار یاخی بوویەکی جەربە" لە هەموو لاوە ئابلوقەی شار بدەن". بەڵام

ئەگەر هێزەکانی میری لەناو شاردا توانی یان خۆیان بۆ "ماوەی سێ چوار ڕۆژ ڕابگرن" ئەوساکە لە بەرنەبوونی ئازوقە پشتی ئابلوقەدەران دەشکێت و بە ناچاری بلاوەی لێ دەکەن. کەوا بێت پێویستە گشت ئەو مەرجانە بە وردی دابین بکرێن کە بۆ مسۆگەر کردنی خۆڕاگریی هێزەکانی میری لەناو شاردا پێویستن بە نیازی پووچەڵ کردنەوەی ئەگەری ئابلوقەدانی سلیماتی لەلایەن شۆڕشگێڕانەوە. لەبەرئەوە "پرۆژەی بەرگری لە سلیمانی" ڕۆژی بیست و هەشتی شوباتی ساڵی 1931 لەدایک بوو، واتە لەو ڕۆژگارەدا کە شێخ مەحمود بە گەرمی خۆی بۆ ڕاپەڕینی داهاتوو ئامادە دەکرد.

ئینگلیزەکان زۆر بە وردی "پرۆژەی بەرگری لە سلێمانی"یان دارشتووە، هێزی میری و لیڤی ئاشووری و پۆلیسی پیادە و سوارەو ژمارەیەک فرۆکەی جەنگییان بۆ تەرخان کردبوو لەگەڵ ئابلوقەدانی شاردا لە دەرەوە دەبوو دوازدە بنکەی سەربازیی سەرەکی لە ناوەوە وەک بازنەیەکی توندو تۆڵی پێکەوە بەستراو "هیچ دەرفەتێک بۆ دزەی دوژمن" نەهێڵنەوە. ئەو دوازدە بنکەیە بەڕیز بەسەر تاولەی سواری و فرۆکەخانەی قەراغ شارو حامییەو سەرەتای ڕێگەی ئەزمڕو نێوانی ڕێگەی گۆیژەو هەڵەبجەو ماڵی عەزمی بەگی بابان و گردی سەیوان و مزگەوتی مەلا مەحمودو گەڕەکی جولەکان و شێوی جولەکان و ماڵی هاروون و دەباخانەگەدا دابەش کرابوون (بڕوانە دەقی نەخشەکەی).

سەرباری ئەوە "پرۆژەی بەرگری" زۆر بە وردی پلانی پاراستنی شوێنە گرنگەکانی ناو شاری دارشتووە، وەک سەراو فرۆکەکانی ئینگلیز و دایەرەی پۆست و ئاشی ئەلەکتریکەکەو چەند مەڵبەند و شوێنێکی تر. چۆن پێویست بوو بەو جۆرە دانەرانی "پرۆژەی بەرگری لە سلێمانی" بایەخێکی تایبەتی یان دابوو بە پاراستنی ماڵو حاڵی گشت فەرمانبەرە ئینگلیزەکانی ناو شار، کە دەبوو لەگەڵ موتەسەریف و گەورە لێپرسراواندا بگوێزرێنەوە ناو سەرا لە ناوەڕاستی شاردا. مزگەوتی گەورەش لەپرۆژەکەدا کراوەتەوە بارەگای کاریەدەست و شۆفێرو سەکنەکانی تیپی گواستنەوە. وەک وتمان ماڵی عەزمی بەگی بابانیش لە قەراغ شار، لەسەر ڕێگەی هەڵەبجەو نزیک گردی سەیوان دەکرایە یەکێک لە بنکە سەربازییەکانی بەرگری لەشار، دیارە نیازیان بووە لەکاتی پێویستیدا ماڵەکەیان پێ چۆڵ بکەن.

بەپێی "پرۆژەی بەرگری" دەبوو ئازووقەی تەواوی مانگێک بۆ گشت سەرباز و ئەفسەرو وڵاخەکانیان بخرێت، ئاوی تەواویان بۆ پاشەکەوت بکرێت، داوودەرمانیان بۆ هەڵبگیرێت. جگە لە 650 گالۆن نەوت و 60 گالۆن بەنزین. بڕیاروابوو لەکاتی ئابلوقەدا هاتوچۆی ناوشار قەدەغە بکرێت، واتە جاڕی "منع التجول" بدرێت، چەند شوێنێک دیاری کرابوو بۆ هاتنە ناو شارو چوونە دەرەوە لێی کە دەبوو لەژێر چاودێری پۆلیسدا بێت. ئەگەر هاتوناچار بوون پۆلیس بۆی هەبوو ڕێگە بدات لە دەرەوەی شار بازاڕێکی تایبەتی بۆ فرۆشتنی بەرهەمی گوندەکانی دەوروبەری سلێمانی ساز بکرێت "تا دوژمن بەناوی قەتارچییەوە، یا بە بیانووی کەلوپەل فرۆشتنەوە نەتوانێت دزە بکاتە ناو شارەوە".

بەداخەوە فرۆکەی ئینگلیز لەناوبارێک بوواری ئەوەی نەدا پەنابەرنە بەر "پرۆژەی بەرگری لە سلێمانی". بەڵام ئەم ڕاستییە لە بایەخی مێژوویی "پرۆژەی بەرگری" کەم ناکاتەوە. ئەویش بەڵگەیەکی تری دوژمنایەتی ئینگلیز و زۆردارانە بەرانبەر کوردو شێخ مەحمود، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێمرۆکە هی ئەو تۆ هەن بە زۆری زۆردارەکی مێژوو سەرووبن دەکەن و لە قوڕە پێوە بە ناوەڕوو هەڵیدەخن، ئەوانەی، مەخابن، لەسەرانسەری دونیادا لە هەڵە زەقەکانی خۆیان بەولاوە هیچ شتێکی تر بە ڕاست نازانن. کاتێک "پرۆژەی بەرگری"م دەخوێندەوە قسەیەکی ئەستەقی ئێدمۆندسم هاتەوە یاد. لە بیستەکاندا ئێدمۆندس بۆ ماوەی چەند ساڵێک ئەفسەری سیاسی بوو لە کەرکوک، زۆربەی کاتی بۆ ڕاووڕوونانی کورد تەرخان کردبوو، جاری وابوو لەگەڵ فرۆکەوانە ئینگلیزەکاندا دەکەوتە ڕاوە کورد. دوای ئەوەی ڕۆژی حەقدەی حوزەیرانی ساڵی 1923 ئێدمۆندس لە یەکێک لەو ڕاوانەی بۆوە لە سلێمانییەوە بە فرۆکە بەرەو کەرکوک گەڕایەوە ئەم چەند دێڕەی لە یاداشتەکانیدا تۆمار کرد:

"هەر ئەوەندە فرۆکەکەمان دواتەکانی داو ڕووی کردە ئاسمان لێشاوی بیرەوەرییی دواچوار ساڵی ژیانم (لە کوردستان) کەوتە دەتگدانەوە لە مێشکمدا، کەمێکیان خۆش، زور بەیان ناخۆش. هەستی پڕ لە نائومێدی ترس و تاڵ و ئاخی دەروونمی هەژاند، لەو ساتەدا پیرەمەگروون هاتە بەرچاوم، وام هەست کرد لەهەر جار گرژترە، لەدڵی خۆمدا پرسیم: ئاخۆ قەدەرچی تری بۆ دوا ڕۆژی ئەم شارە شۆڕشگێرە هەڵگرتووە قوربان؛ جەنابی ئێدمۆتدس مەگەر هەر پیرەمەگرونی سەرکەشی پرچ کلۆسپی ڕۆژی حەشر وەڵامی ئەو پرسیارەت بداتەوە، ئەو ڕۆژەش مەگەر فەرهەنگە بەنرخەکەت لە حزوور عەرشدا تکاکارت بێت!!.



# چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی چینی کرێکاری کورد

ئەدکتێبی چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی گەلی کورد:

دەگمەن نووسەرانی خۆمانو بێگانە بیریان لەکرێکاری کورد کردۆتەوە دوور ئەڕۆین لەهیچ کامێك لە بەرهەمەکانی مامۆستا ئەمین زەکی ی مێژوونووسی گەورەماندا زۆر کەم ناوی کرێکاری کورد هاتووە. بێگومان ئەمیش کەلێنێکی ترە لەو دەیان کەلێنانەی لەمێژووی نوسراوماندا هەن، بەلام کەلێنێکی گەورە! وابزانم لەراستی دوورناکەومەوە گەر بڵێم ئەدەبی کوردیش، بەداخەوە، لەو کەلێنە بێبەش نییە. کرێکاری کوردیش وەك روناکبیرو جوتیارو هەموو خەلکێکی تر خاوەن دڵو هەستە، دڵی وەك هەموو کرێکارێکی تر ساقو هەستی وەك ئەوان بەرزە، ئەویش لەهەموان زیاتر ئارەق دەرێژێتو لە هەموان هیلاکو بێ کات ترە، بۆیە کەمتر باسی خەلك دەکاتو زیاتر لە هیلاکیو ئەردو ئازارو نەبوونیو بێ مافی دەگاتو حەز بە پاریدەی هەموو لیقەوماوێك دەکات، تاڵ لای ئەو تاڵترو شیرین لای شیرین ترە. لەزەت لەهەموو خۆراکێك دەبینێت. وەك هەموواناو، رەنگینی زیاتر، حەز بە چاوی کاڵو لێوی ئاڵو گۆنای پرخاڵ دەکات، کاتی بوایە ئەویش چاوباز دەبوا. ژمارەیان زۆرو کێشەیان زۆرتر، بۆیە ژیانیان پڕ لە چیرۆکی بێهاوتاو داستانی دانسقەو تابلۆی رەنگینە. حەیفە دەستی ئەدیبی کوردی دڵ پەڕەی گوڵ کە تالاوی زوخاوی ژیان ڕاخاوی مێشکو تەلەمی داوە، زوو نەگاتە گەرهەرو نەتماسی ئەو خەونە دەولەمەندە!

لەم وتارەدا هەوڵ دەدەین بە کورتی چەند رووپەکی سەرەتای دروست بوونو هاتنەکایەی چینی کرێکاری کورد بخەینە بەرچاو کە دور نییە سەرنجی خوێنەر راکێشن.

لەسەردەمی هەرە کۆنی شارستانیەتی مرۆڤەوە کرێکارو کرێگرتە هەیە. بەلام هیچ کاتو لەهیچ شوێن ئەو کرێکارە پەرشو بلاوانە نەبوونەتە هێزی بنچینەیی هێنانە بەرهەم لەناو کۆمەلدا تا پەیدابوونی سەرمایەداریی. لەگەل ئەمیاندا دور چینی نوێ دێتەکایەوە، بۆرژوازیو کرێکار لەبەر ئەوەش کە پەیوەندیی سەرمایەداری لە ئەورووپای رۆژئاوا بەر لەشوێنی تر دروست بو، هەر لەوێش دەوروبەری سەدەی چواردەو پازدە بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئادەمیزاددا چینی کرێکار وەك هێزێکی دیاری کۆمەل هاتە ناو.

لەزۆربەی ولاتانی تر، بەتایبەتی لە رۆژهەلاتی نزیکو ناوەراست، پەیدابوونی چینی کرێکار زۆر لەوە دواکەوت. جۆرو هۆی دروست بوونەکەشی گەلێك لەگەل ئەو جیاوازە. لە ئەورووپا ئالو گۆڕەکانی ناو کۆمەل چینی کرێکاریان درووست کرد، بەلام لە ولاتانی رۆژهەلات ئەو گۆڕانە لەهۆی تێکەل بوون بە بازاری سەرمایەدارییەوە کەمتر دەوریان بینی. لەسەدەی نۆزدەوە لێشاوی تێکەل بوونی ولاتانی رۆژهەلاتی نزیکو ناوەراست بە بازاری سەرمایەداریی جیهان دەستی پێ کرد. ئەمەو گەیشتنی ژمارەیەك دەستکەوتی پیشەسازیی نوێی ئەورووپا بوونە هۆی دارشتنی بەردی بناغەی دروست بوونی چینی کرێکاری زۆربەی ولاتانی ئەم ناوچەیە

لە کوردستان ئەم دیاردەیە لەبەر هۆی گرنگ تا رادەیەك لەو ولاتانە دواکەوت، یەکەمیان هێزی زۆری پەیوەندی دەرەبەگییو پاشماوەی ژیانی کۆچەریو نیمچە کۆچەریی ناو کۆمەلی کورد بوو، ئەوی تریان نەبوونی دەربەندێکی سەربەخۆ بوو کە کەلوپەلی کوردستانو بەرهەمی هێنراوی پیشەسازیی لەورووپای تیدا کۆبێتەوەو پێویستی بەژمارەیەکی زۆر کرێکارو چەند کۆمپانیایەك بێت.

بەلام بەرامبەر بەوە مەرجی تری پێویست بۆ دروست بوونی ئەم چینە تازە لەئارادا بوون یەکەمیان دەولەمەندیی کوردستانە کە بەرهەمی کشتوکالو ئاژەلی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە گەیشتە چەند بازارێکی گرنگی ئەورووپا. کەلوپەلی دروست کراوی ئەوێش بەخێرایی گەیشتە کەلاترین شارو گوندی لای خۆمان. تەنانەت بەر لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە ئینگلیزەکان کۆمپانیای تایبەتیان لەشاری وەك دیاربەکر دامەزراند، هەرلەخۆشەوە نییە گ. ئاپێر پێش پەنجا سال شاری کرمانشای ناو ناوە بەندەری کەلوپەلی ئینگلیزیو هندی.

دووەمیان پەرەسەندنی شارە کوردەکانو بەهێزبوونی پەیوەندیی بازرگانییان لەگەل شارانی ترو پێشکەوتنی پیشەسازیی خۆمالییانە. لەم رواتەوە بۆ ماوەیەکی زۆر کوردستان شان بەشانی مەلبەندەکانی تری رۆژهەلاتی نزیکو ناوەراست هەنگاوی بەرەو پێش چوونی دەنا. لەرێگەی ژمارەو بەراوردەوە دلنیا دەتوانین بلێین سەدەکانی ناوەند شارە کوردەکان لەگەلێك رووەوە وەك شارانی تری رۆژهەلات پەرەی سەندو قەوارەی خۆی وەردەگرت. گەریدەی تورکی ناودارو سەرچاوەی رەسەن ئۆلیا چەلەبی (1611– 1679) کە ناوەندی سەدەی حەڤدە هاتۆتە کوردستان لەبەرگی چواردەمی "سیاحەتنامە"کەیدا باسی گەورەیی ژمارەیەك شاری وەك دیاربەکرو بەدلیسی کردووە. ئەو بازارو قەیسەریانەی دیاربەکر کە ئەو باسیان دەکات ئەوسا لەزۆر ناوچەی رۆژهەلات کەم وێنە بوون. هەر بەپێی قسەی ئەو دیاربەکر 12 گەرماو (حەمام)ی گشتیی تیا بووەو (140) مالیش گەرماوی خۆیان هەبووە. بەدلیس (5) گەرماوی گشتیو (600)ی تایبەتیی تێدا بووە. ئەم ژمارەیەی دواییان بەلگەی پرمانای دەولەمەندیو رەفاهەتە.

دوایی ئۆلیا چەلەبی بە دەوروبەری 150 سالێك نوێنەری ناوداری ئینگلیز لە عێراق کلۆدیۆس جێمس ریچ باسی چەند شارێکی تری کوردستانی کردووە. قسەکانی ئەویش بەلگەی مێژوویین دەربارەی ئالو گۆڕو بەرەو پێش چوونی شارە کوردەکان. سنەی بە (5) هەزار مال داناوە کە هەر جۆر



لێکی بدەیتەوە لە 20 هەزار کەس تێدەپەڕێت دانانی ژمارەیەکی وا زیاتر خۆدەنوێنێت گەر بێت و بزانین ژمارەی دانیشتوانی شاری قودس ساڵی 1814 دەوروبەری 12 هەزار و بەغدا ساڵی 1831 نزیکەی 20 هەزار و عەمانی پایتەختی ئوردونیش ساڵی 1880 تەنها هەزار کەس بووە.

پەیوەندی بازرگانی نێوان شارەکانی کوردستان خۆی و ئەو مەڵبەندو ناوچانەی لێوەی نزیک بوون بە پەیدابوونی قۆناغی دەرەبەگی خراپ نەبوو. بەپێی سەرچاوە کۆنەکان تاوەکو سەدەی نۆزدەش ئەستەموڵ و دیمەشق و حەلەب و بیرۆت تا رادەیەکی زۆر بەمەڕو بزنی کوردستان بەڕێوە دەچوون. تەنها شاری ئەستەموڵ هەر ساڵی یەک ملیۆن و نیو سەر مەڕی لێوە بۆ دەهات. ئەو سوپا گەورەی بە سەرکردایەتی ئیبراهیم پاشای کوڕی محەمەد عەلی گەورەی فەرمانڕەوایی میسر ساڵانی 1831- 1832و 1839 هێرشی بردە سەر سوریا بە مەڕو ماڵاتی کوردەواری دەژیا. بەر لەوەی سەدەی رابردو کۆتایی بێت تەنها ئەستەموڵ و حەلەب و بەغدا هەر ساڵەی 3 ملیۆن مەڕی کوردستانیان بۆ دەهات. بەندەری سامسۆنیش بە تەنها ساڵی 20 ملیۆن هێلکەی لێوە دەهاتی. دروست کردنی پردی قلیاسانیش لەلایەن دەوڵەمەندێکی سلێمانییەوە تەنها کاری خێر نەبوو، ئەگینا دەبو بەر لە قلیاسان لە تانجەرۆ دروستی بکردایە چونکە ئەمیان ئاوی زۆرترو کاتی لافاو ترسدارترە.

بەهەمان دەستور پیشەسازیی خۆماڵی کوردستان بەر لە تێکەڵ بوونی بە بازاڕی سەرمایەداریی جیهان هەنگاوی باشی بەرەو پێشناو هیچی لە پیشەسازیی وڵاتانی دەوروبەری کەمتر نەبوو. جلو بەرگی نەتەوەیی ژمارەیەک نەریتی تایبەتی هەوێنی باشی ئەو بەرەو پێشچوونە بوون. دیسان لە بەرگی چوارەمی "سیاحەتنامە"کەی ئۆلیا چەلەبیدا گەلێک بەڵگەی پڕ بایەخ و مانا لەم بارەوە وەچەنگ دەکەون. بەقسەی ئەو لە سەرانسەری جیهاندا لە وێنەی زەردەنگەڕی دیاربەکر کەم بووە. وەک دەڵێت کاری جۆلاو بەرگ دروو دەباخانەکانی بەدلیس دەنگی دابووەوە، بەڕادەیەک "چەرمی بەدیاری دەبرایە وڵاتی فەرەنگ".

دوای ئەوروبەری دوو سەدە، واتە ناوەندی سەدەی نۆزدە، تایلەری گەڕیدەی ئەوروپایی لەو کتێبەیدا کە بە ... ی "گەشتێک بە کوردستاندا" بڵاوی کردۆتەوە باسی کوتاڵی ئاوریشمی دیاربەکر دەکات و بۆ چاکی لەگەڵ ئاوریشمی بەناوبانگی حەلەب بەراوردی دەکات و دەڵێت ئەوان هەرزانتر دەفرۆشرێت بۆیە لە هەموو ئەو ناوچانەی کەوتونەتە نێوان دیاربەکرو دەریای رەشەوە، بازاڕی گەرمە. ناونانی گەڕەکی شارێکی وەک سلێمانی بە (سابونکەران) شتێکی مانادارە بۆ ئەم مەبەستەی ئێمە باسی لێوە دەکەین. بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان بە ماوەیەک دەیان خێزانی ئەم گەڕەکە بەدروست کردنی سابونەوە خەریک بوون و ساڵی بەلای کەمەوە 500 تەنیان دەناردە بازاڕەکانی شارو دەوروبەری و چەند مەڵبەندێکی ترو تەنانەت لێشی دەگەیشتە شاری وەک بەغداو تەوریز.

لە کوردستانیش بەچەشنی ناوچەکانی تری رۆژهەڵاتی نزیک و ناوەڕاست تێکەڵ بوونی خێرا لەنیوەی دووەمی سەدەی رابردووەوە بە بازاڕی سەرمایەداریی جیهان کاری کوشندەی کردە سەر پیشەسازیی خۆماڵی کە تاک تاکە خەریک بوو هەنگاو بەرەو قۆناغی مانیفا کتور بنێت. کاری بنەماڵەی موتابچی کە لە سلێمانی جەواڵیان دروست دەکرد نیمچە مانیفا کتۆرەیەک بوو بۆ خۆی: کرێکاری کرێ گرتە کاری تێدا دەکرد، ئامرازی ئاراندەیەک پێشکەوتوویان بەکار دەهێنا: دابەشکردنی کار (تقسیم العمل) تێیدا سیمای روونی خۆی وەرگرتبوو جۆری دروستکردنی تۆپەکانی وەستا رەجەبیش لە رواندوز نموونەیەکی تری ئەم راستییەیە. شۆرەتی تۆپەکانی کە بۆ میری رەواندوزی دروست دەکردن دەنگی دابوەوە. زۆری ئەو 80 تۆپەش کەوالی موسڵ هەیبو لە دەستکردنی کرێکارانی رەواندوز بوون. شایانی باسە ئەو مەعدەنەی بۆ دروستکردنی تۆپەکانی بەکار دەهێنران لە دەوروپشتی رەواندوز بەکاری کرێکاری کرێ گرتە دەردەهێنران لە مەیدانی دروستکردنی بەرەو جاجم و چۆخیشدا خەریک بوو وردە ئاڵو گۆڕ دەست پێ بکات.

بەڵام تەنانەت ئەم جۆرە پیشەسازیانەش نەیانتوانی خۆیان لەبەر لێشاوی کەلوپەلی هەرزان و چاکتری کارگەکانی ئەوروپادا رابگرن، بۆیە یەک لەدوای یەک دامو دەزگایان پێچایەوە. کارتسۆف ساڵی 1896 نوسیویە دەڵێت: "جاران چۆخی کورد بەناوبانگ بوو، بەڵام ئێستا کوتاڵی ئینگلیز بەجارێک تەنگی پێ هەڵچنیوە".

ئەو یەک دوو دوکانی قیشەک پڕکردنەوەی دوای شەڕی یەکەمی جیهان خاوەنەکانیان لە سلێمانی بە کولەمەرگی دەژیان پاش ماوەی 150 دوکانی لە خۆیان گەورەتر بوون کە بەر لەشەڕ مارک سایکس لەوێ دیبوونی.

هەرچۆن بێت ئەو جۆرە شوێنانەی بەکاری پیشەسازیی خۆماڵییەوە خەریک بوون و هەنگاوی باشیان بەرەو پێش نابوو یەکەم توێکڵی تەنکی چینی کرێکاری کورد بەدی دەکرێت. لەلایەکی ترەوە قەیرانی ئەو پیشەسازییە لەچینی داهاتووی کرێکاری کورد کەوت، چونکە بەشی زۆری کارگەرانی چوونە ناو ریزەکانی ئەو. چەوساندنەوەی دەرەبەگیش لەلای خۆیەوە بە هەزاران جوتیاری رووت و قووت و برسیی ناردە بازاڕی کار لەشارەکان و ئەوانیش، تایبەت لەبەر هەرزانیان، بوونە سەرچاوەی هەرە گرنگی دروست بوونی چینی نوێی کۆمەڵ. ژمارەی ئەم جۆرە کەسانە کە لە هەندێک ناوچە هەژاریان پێ دەگوتن، جاری وا هەبوو پتر لەنیوەی دانیشتوانی مەڵبەندێکیان پێک دەهێنا. بەپێی هەندێک سەرچاوە ئەوانە لەناوچەیەکی وەک شنۆ (ئوشنۆ)ی نزیک مەهاباد لە 80٪ی هێزی کاریان دروست دەکرد (10 هەزار لە 12 هەزار کەس).

لەوێنەی ئەمە تەنها مەگەر لە ئینگلتەرەی کۆتایی سەدەکانی ناوەند هەبووبێت کاتێک بەهۆی قازانجی زۆری خوری یەورد دەوڵەمەندو دەسەڵاتدارانی ئەو وڵاتە زەوییەکانیان دەکردە لەوەڕگەو بەوجۆرە بە دەیان هەزار جوتیار بێ داڵدەو پەناگە دەمانەوەو ئاوارەی دارستان و دەشت و دەرو شاران دەبوون و بەگژگیاو پاشماوەی خەڵکی دەژیان و ئەمەش هەستی تۆماس مۆری بەناوبانگی وا بزواند "یۆتۆپیا" بنووسێت و لەسە بەناوبانگەکانی بکات: "خەریکە مەڕ پیاو بخوات". لێرەدا سەیر ئەوەیە کە دەردو ئازاری هەژارانی



کوردیش مەستی شیرۆتی شاعیری جوڵاندووەو بە زەوە بەرەو فابریقەکانیان دەنێرێت.

ژمارەی هەژاری شارو تایبەت لادێی کوردستان هێند زۆر بو لەوانە نەبو بازاڕی کەم دەرامەتی کارێکی تری ئەوتۆ دەست نەدەکەوت. لەبەر ئەوە بە هەزارانی هەژاری کورد رویان دەکردە شاری گەورەی وەک ئەستەموڵو بە هەمو کارو نرخێک قایل دەبون (بەر لەشەڕی یەکەمی جیهانی ژمارەیەکی بێشومار لە حەماڵی رەش‌و رووتی کورد بازاڕی ئەستەموڵو بەغدار شاری تریان تەنی بو). هێ وایان هەبو لە ناو نەبونی دەچونە شاری بچووکی وەک حەلەبی شامو بێروتی لوبنانو ئەدەنی تورکیا، یا ناوچەی وەک ناق چەمو قەرەباغی ئازەربایجان. بەڵام توانای بازاڕی کاری ئەو جۆرە بێکارەی خۆیان دایە دەست قەدەرو گەلێکیان دەریای ئەتلەسی‌یان بڕی‌و گەیشتنە خاکی ئەمەریکا. زۆربەی ئەمانە خەڵکی دەرسیم بون.

یونی کاتە سەعدەن لەناوچە کوردەوارییەکانو دەوروبەری هۆیەکی یاریدەدەری تری پەیدابونی کاری کرێگرتە بو لەوێ بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان. ئەوسا بەشی زۆری کرێکارانی کانە خەلوزەکانی زەنگولداغ کورد بوون. کورەی جوڵەمێرگیش ئاسن‌و مسو زەرنیخیان دەردەهێناو لەوەوە ئاوی یەکێک لەناوچەکانی بۆتە زەروتیخ مەیدان. بەشێک لەو زەرنیخەی ئێرە دەردەهێنرا دەنێررایە بازاڕی دەرەوە. بەپێی ژمارەیەک سەرچاوە سالی 30 هەزار قەنتاری لێ دەنێررایە ئەستەموڵو بەغداو هندستان. هەر ئەو سەردەمە ژمارەیەک کورد بوبونە کرێکاری کانەخەلوزەکانی نزیک کفری کە بەرهەمی ساڵانەی کاریان بەر لە شەڕی یەکەمو کاتی ئەو شەڕە هەزار تەن دەبو.

روداوەکانی شەڕی یەکەمی جیهان بونە هۆی پەرەسەندنی ژمارەی کرێکاری کورد بەجۆرێکی هەست پێکراو. کوردستان بۆ خۆی بووە یەکێک لەشەڕگە دیارەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستو سوپای چوار وڵاتی تێ رژا. ئاگری شەڕ زۆربەی ئەو ناوچانەشی گرتەوە کە لێوەی نزیک بون. وەک ئاشکرایە تەکنیکو خێرایی دەوری گەورەیان لەو شەڕەدا بینی، بۆیە لەهەر چوار لاوە دەست کرا بە کردنەوەی رێگەو بانو دامەزراندنی بنکەی سەربازی. بە هەزاران هەژاری کورد لەو شوێنانە بونە کرێکار. ئەم دیاردە نوێیە بەتەواوبونی شەڕ کۆتایی نەهات. هەر بۆ نمونە سالی 1925 پتر لە 2250 کورد لە عێراق کرێکاری شەمەندەفەر بون. بە پێی هەندێک سەرچاوەی باوەڕپێکراو ناوەندی بیستەکان ئەو کرێکارانە لە 23٪ هەموو کرێکارانی شەمەندەفەری عێراق بون، زۆری ئەم ژمارەیە زیاتر لەوەدا خۆ دەنوێنێ گەر بێتو بزانین زۆربەی هەرە زۆری خەتی شەمەندەفەری ئەوسای عێراق لە باشورو ناوەندی وڵاتدا بون، وە جگە لە عەرەب و کورد ژمارەیەکی زۆر هندی (142 1)و ئێرانیو ئەرمەنو ئاسوریو تورکو هی تر کرێکاری ئەو دەزگایە بون.

دیسان دوای شەڕی یەکەمی جیهان ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە هەژاری کورد بونە کرێکاری ئەوتار دامەزراندنی لولەکانیو دروستکردنی رێگەوبانو خانوبەرەو شتی تر. کۆتایی بیستەکان لە هەموو عێراق 250 .4 کەس بە دروست کردنی رێگەوبانەوە خەریک بون کە ژمارەیەکی زۆریان کرێکاری رێگەی نێوان کەرکوکو سلێمانیو کەرکوکو هەولێرو هەولێرو موسڵو هەولێرو رەواندوز- رایات بون. ئینگلیز بایەخێکی زۆریان دابو بە رێگەی دواییان، واتە هەولێر- رەواندوز- رایات، چونکە جگە لە بایەخی ستراتیجی دەیانویست بیکەنە یەکێک لەهۆکانی زیاتر بەستنەوەی بازاڕەکانی رۆژئاوای ئێران بەجیهانی سەرمایەدارییەوە، تا چەند بتوانن ئەوەندەی پەیوەندی ئابوری ئەو وڵاتە لەگەڵ شورەوی کزبکەن.

کرێکاری کورد یەکسەر دڵسۆزیو پەرۆشی لەکاردا توانای فێربونی خێرای نیشاندا. گەلێک بەڵگەی سەیر بۆ ئەم راستییە بەدەستەوەیە. وابزانم لە هەموان گرنگتر لەم لایەنەوە یەکگرتنەوەی نرخاندنی کاربەدەستانی ئینگلیزو ئەڵەمان لە کاتێکدا کە لە خەندەقی جیاوازدا بەرامبەر یەیەک وەستابون. ئەڵەمانەکان سەرەتای شەڕی یەکەمی جیهان دەستو برد کەوتنە دروست کردنی ئەو بەشانەی پرۆژەی ئاوداری خەتی شەمەندەفەری بەغدا کە هێشتا تەواو نەبوبون. بەو جۆرە خەتێکیان لەنێوان بەغداو سامەڕەدا راکێشا کە کرێکاری کوردیش لە دروست کردنیدا بەشدار بون. توماس ئەڵەمانی داگوبێرت لەم بارەوە نوسیویە دەڵێت:

ئەندازیارە ئەڵەمانەکان لە کوردا "باشترینو دڵسۆزترین کرێکاریان دیبەوە".

جەنەرال هالدینی فەرماندەی هێزەکانی ئینگلیز لە عێراق دەوروبەری هەمان کات بێ ئەوەی بزانێ داگوبێرت کێیە، یان رای ئەندازیارانی ئەڵەمان چییە، بە هەمان دەستور باسی کرێکاری کوردی کردووەو رەزامەندی زۆری بەرامبەریان نیشان داوە. هەر لەبەر ئەوەش هیچ سەیر نییە رۆژانەی کرێکاری کورد لە هی تر زیاتر بوو. ئەوسا هەندێک دەزگا رۆژی نزیکەی 21 ئانەی دەدا بەو بەرامبەر بە 14 ئانە کە هی وەک ئەو وەریان دەگرت. لەوەش ماناداتر ئەم نمونەیەیە: دەزگای شەمەندەفەری ئینگلیز لە عێراق لە بیستەکاندا دوو جۆر کرێکاری هەبوو، یەکەمیان ئەو کرێکارانە بون کە بەکاری ئەساسی یەوە (Capital Works) خەریک بون، دووەمیشیان ئەوانەیان بون کە کاریان لە دروست کردنی خەتی تازەدا دەکرد. سالی 1924- 1925 لە 2.247 کرێکاری شەمەندەفەری کورد تەنها 729 یان لە جۆری دووەم بوونو ئەو باقی یەکەیان (1.545 کرێکار) لەجۆری یەکەم بون.

دیارە ئەم راستییە ئەبووە هۆی ئەوەی تالاوی چەوساندنەوەی کرێکاری کورد لەهی هاوەڵەکانی کەمتر بێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە ژمارەیەک نمونە هەر ئەو سەردەمە وای نیشان دەدەن کە هەندێک جارو لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی ئەو چەوساندنەوەیە توندتر بووە. لەگشت ناوچەکانی باکوری عێراق رۆژانەی کرێکار لەناوچەکانی تر کەمتر بوو. بەرێتە کرێکارانی کۆمپانیاکانی نەوت دەبوو حەفتەی 54 سەعات کار بکەنو بەرامبەر بەوە 7 تا 10 روپییەیان وەردەگرت، کەچی کرێکاری چینێ لە بەغداو کرێکاری بەندەری بەسرە حەفتەی 48 سەعات کاریان دەکردو بەرامبەر بەوە هەر یەکەیان 3تا 6 روپیە زیاتریان لەوان وەردەگرت. باری کارو رۆژانەی ئەو کرێکارە کوردانەی بەدروست کردنی خانوبەرەو رێگەوبانەوە خەریک بوون گەلێک لەوەش خراپتر بوو. لەوانە زۆر جار مەلایانکان دەچونە سەر کارو لەگەڵ بانگی شێواندا دەستیان لێ هەڵدەگرتو بەرامبەر بەو هەموو کارە رۆژی 18 فلسیان وەردەگرت کە وەک ئینگلیزەکان خۆیان دانی پێدا دەنێن ئەو پارەیە تەنانەت "بەشی نانو جگەرەی نەدەکرد".

وێڕای ئەوە کرێکاری کورد، وەک کرێکاری ناوچەکانی تر، ماوەیەکی دورو درێژ نەیتوانی خۆی لە پەیوەندیو تەریقی دەرەبەگی قوتار بکات. زۆر جار ئەو کرێکارانە دەگەڕانەوە گوندەکانیان بۆ کاری کشتوکاڵو یاریدەی کەسوکاریان. زۆربەیان بەشێکی داهاتی کرێکاریی خۆیان هەر وەک جاری جاران دەدا بە ئاغاو سەرەک هۆزەکانیان.

بەر لە کۆتایی با ئەوەش بڵێین کە کرێکاری کورد لە سەرەتای سەرەتاوە بەگیانی برایەتی گۆش بووە، چونکە هەمیشە چ لەخاکی خۆیو چ دوور لێی شان بەشانی کرێکارانی تر کاری کردووەو ئازاری چەوساندنەوەی چێشتووە. جوانترین بەڵگەی ئەم راستییە رەنگین ئەو قسانەبن کە لەگەڵ تەواوبوونی رێگەکەی هەولێر- رەواندوز- رایات لەسەر تاشە بەردێک نووسیبوویان:

"ئێمە کە هەزاران کەسینو بەعەرەبیو ئەرمەنیو ئینگلیزیو هندیو کوردیو روسیو تورکی قسە دەکەین ئەم رێگەمان بۆ خزمەتی هەموو گەڕیدەیەکی بێ‌وەی دروست کرد".

لیستەی ناوی ئەم زمانانە لە دەزگای شەمەندەفەری عێراق دەگاتە 16 ناو. جگە لەوانەی سەرەوە ئەم ناوانەشی دەچنە سەر: سریانیو میسریو فارسیو تونسیو ئیتالیو یۆنانیو مەنگاری. لە گاوربا غیش هاوینی سالی 1946 دەنگی زوڵاڵو خوێنی گەشی کرێکاری کورد تیکەڵ لەگەڵ دەنگو خوێنی پیرۆزی براکانی ئاوازێکی بەجۆشو لاپەڕەکانی پڕ شانازیی دروست کرد!



# سەرنجێکی مێژوویی لە زمانەکەمان

ئەم وتارە لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی‌یە لە زمانەکەمان، وەڵامێکە بۆ ئەوانەی ئەڵێن زمانەکەمان لقێکە لە زمانی فارسی.

ژمارەیەک لەمێژوونووسان وا ئەزانن زمانی کوردی بەشێکە، یا زاراوەیەکە لە زمانی فارسی.

زۆر دوور ئەڕۆین ئەمڕۆیش لە نووسراوەکەیدا (( لمحات من تاريخ العالم )) لە لاپەڕە 259 دا ئەڵێت (( کوردەکان بە زمانی فارسی‌ی کۆن گفتوگۆ دەکەن )).

بەڵام ڕەخنەی لێ ناگیرێت چونکە خۆی لە پێشەکی‌ی پەڕاوەکەیدا داوای لێبوردنی کردووە لە هەموو جۆرە کەموکوڕی‌یەک لەبەر ئەوەی پەڕاوەکەی لە کاتێکدا نووسیوە کە لە بەندیخانەدا بووەو بەشێوەی نامە ناردوویەتی بۆ کچەکەی بێ ئەوەی دەستی بگاتە هیچ سەرچاوەیەک تا کەموکوڕی لە باسەکانی بڕێت، هیچ دووریش نی‌یە وشەی ئێرانی‌یان لە نووسراوەکەیدا بە فارسی تەرجەمە کردبێت، خەتای ئەمەش دەکەوێتە سەر شانی ئەو کەسانەی پەڕاوەکەیان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، چونکە زۆر لە مێژوونووسەکان وشەی ئێران بە واتای - هیندو - ئەورووپی بەکاردەهێنن بەڵام زۆر نووسەری تر کە هیچ دوور نی‌یە لەبەر هۆیەکی شاراوە زمانی کوردی دەگێڕنەوە بۆ سەر زمانی فارسی و ئەمەش لە بنچینەوە بە بیرێکی چەوت دەژمێررێ، کەواتە با ئەختێ لەم باسە بدوێین بە شێوەیەکی مێژوویی و زانیاری ڕاست هەرکەسێک بیەوێ لە ڕەگەز، یا زاراوەی هەر گەلێک لە گەلەکانی ڕۆژهەڵات بدوێ پێویستە بگەڕێتەوە بۆ پەڕاوەکانی مێژوونووسەکان،بە تایبەتی ڕۆژهەلاتناسەکان. بەڵام ئەمانیش هەموو بە سەر ڕاستی باسەکانیان نەنووسیوە، بەڵکو، هەروەک ماموستا ئەمین زەکی دەڵێ: دەتوانین بیانکەین بە سێ بەشەوە. بەشێکیان هیچ مەبەستێکیان نەبووە لە نووسینەکانیاندا ئەوە نەبێت پێیان بگوترێ مێژوونووس. بەشی دووەمیشیان بە پێی ڕێگەیەکی دانراو لە شوێنی خۆیەوە باسەکانیان نووسیوە. خۆ هیچ دوور ئەڕۆین ئەگەر یەکێک لەمانە ئێستە بیەوێ لە بارەی کوردەوە بنووسێ و شتێکی بە دەمدا بسووڕێ لە لایەن تورانی‌یەکانەوە، ئەوا یەکسەر بێ ئەوەی سێ و دووی لێ بکات گەلی کورد دەگێڕێتەوە سەر تورک و پێیان دەڵێ (( تورکە شاخاوی‌یەکان )). بەشی سێیەمیش ئەو زانا پایە بەرزانەن کە لە باسەکانیدا ڕێگەی زانستی‌ی ڕاستیان بەرەڵا نەکردووە لەبەر نرەی پارە ورشەی زێڕ. ئەوانە بەسیانە کە بە چاکە ناو دەبرێن و جێگەی خۆیان لە لاپەڕەی مێژوودا کردۆتەوە.

جا ئەم دەستە زانایە چونکە ڕێگەیەکی ڕاستیان گرتووە نووسینەکانیان پڕ کەڵکە، بەڵام ئەوانەی کورد دەگێڕنەوە سەر ڕەگەزی تورک، یا فورس، یا دەڵێن زمانەکەیان زمانی خۆیان نی‌یە، بەڵکو بە زاراوەی دراوسێکانیان گفتوگۆ دەکەن، ئەوانە هەموویان لە دەستەی یەکەمن یا دووەم کە لە خۆیانەوە بیروباوەڕیان دروست کردووە بۆفرۆشتن. بەڵام دەریایەکی خاوێن و جوان ئەگەر چی جۆگەیەکی پیسیشی تێ بڕژێ لیخن نابێت.

خۆ ئەوەش ئاشکرایە لە گەلی کورد هەزارو یەکەستر نی‌یە تاوەکو بڵێین زاناکانی دەستەی سێیەمیان هانداوە بۆ ئەوەی لە بارەی زمان و مێژووی کوردەوە بە ئارەزووی گەلی کورد بنووسن. کەواتە تەنها ئەوانن ڕێگەیەکی ڕاستی زانیاری‌یان گرتووە بۆ لێکۆڵینەوە لە بنچینەی کورد و زمانەکەیان، نەک لەبەرخاتری چاوی کاڵی کورد، بەڵکو لە ڕێی زانیاری‌یدا، جا بیروباوەڕی ئەمان نەبێت بیروباوەڕی دوو دەستەکەی تر هیچ نرخێکی نی‌یە و بە هیچ ناچێت.

ئا ئەمە بەسە بۆ هەموو کەسێکی تێگەیشتوو، کورد بێت یا نا، بۆ ئەوەی بزانێ: هەر کەسێک ڕەگەزی کورد، یا زمانییان بگێڕنەوە بۆ سەر ڕەگەزێک یا زمانێکی تر لە ڕاستی‌یەوە دوورە و لەبەر هۆیەکی شاراوە ئەو درۆ زلانە ئەکات، ئەو درۆیانە مێژوو هەرگیز لێیان خۆش نابێت!

ئەمەی نووسیمان سووکە وەڵامێکە بۆ ئەوانەی دەڵێن زمانی کوردی فارسی‌یە. بەڵام با ئەختێکی تریش لەم باسە بدوێین و پەنا بەرینەبەر بیروباوەڕی ڕۆژهەڵاتناسە سەر ڕاستەکان، ئەوانەی ڕێگەی زانیاری‌یان بەرنەداوە.

سێر سدنی سمث لە ژێر ناوی "کوردستانی کۆندا" بە کورتی دەڵێت: هیچ گومانی تێدا نی‌یە ئەو کاردۆخی‌یانەی زەینەفون باسیان دەکات هەر گەلی کورد بوون. جا با بزانین زەینەفون کێ بووەو چی‌ی گوتووە لە بارەی گەلی کوردەوە.

کۆرشی بچوکی برای ئەرتەحششتای پاشای فارس سەرپەرشتی کاروباری ئاسیای بچوکی دەکرد. دەورووبەری ساڵی 404 ی پێش لە دایک بوون کۆرش ئارەزووی ئەوەی دەکرد جێگەی بگرێتەوە و خۆی ببێتە پاشای فارسەکان، لەبەر ئەوە سوپایەکی گەورەی بۆ هێنانەدی‌ی ئامانجەکەی پێکهێنا. جگە لەم سوپا گەورەیە سوپایەکی تریشی لە ئیغریقەکان پێکهێنا بۆ یارمەتی‌ی سوپای یەکەم. ئەم سوپا ئیغریقی‌یە لە مێژوودا بە "سوپای دە هەزارە" ناسراوە.

پاش کوشتنی کۆرش لە عێراق، زەینەفون کە یەکێک بووە لە سەربازە ئیغریقی‌یەکان کاروباری سوپاکەیانی گرتۆتە دەست و بۆتە سەرۆکی و سوپاکەی گێڕاوەتەوە بەرەو وڵاتی خۆیان یۆنان. باسی چوون و هاتنەوەی ئەو سوپایەو هەموو بەسەرهاتی بە شێوەیەکی مێژوویی کاتی خۆی لە پەڕاوێکدا نووسراوەتەوە کە باسی کوردیشی تێدا کراوەو دەڵێت: کاتێک سوپاکەمان گەیشتە ناوچەی زاخۆ گەلێکی ئازاو شەڕکەرمان لێ هەڵکەوت ناوی کاردۆخی‌یە .. ئەم گەلە لە ناوچەیەکی شاخاویدا دەژیان و ئارەزووی جیابوونەوەیان هەبوو لە شاو حەزیان بە سەربەخۆیی و ئازادی دەکرد.

کەواتە لەمەوە بە باشی بۆمان دەردەکەوێ کە تینوێتی ئەو گەلە بۆ سەربەستی و ئارەزووی ئازادی‌و جیابوونەوەی لەبەر ئەوە بووە کە زمانەکەیان زمانێکی سەربەخۆ بووە، نەک زمان یا زاراوەیەکی بێگانە.

ئینجا با بگەڕێینەوە سەر باسەکەی سێر سدنی سمث کە لە لایەکی تری وتارەکەیدا دەڵێت:

لەم دواییەدا بیروباوەڕی ئەو زانایانەی لە زمانی کوردی دەکۆڵنەوە بە تەواوی گۆڕاوە و دەڵێن، زمانی کوردی نە لە فارسی و نە لە هیچ زمانێکی ترەوە وەرنەگیراوە، بەڵکو زمانێکی تایبەتی و سەربەخۆیەو هەر لە کۆنەوە هەڵگرو داگیری خۆی جوێ بووە. سدنی سمث کۆتایی باسەکەشی بەوە دێنێت کە ئەڵێت: (( ئەوانەی وا دەزانن زمانی کوردی زاراوەیەکی فارسی‌یە مێژوو و زانست پێچەوانەی بیروباوەڕیانە )).

بەڵام ماموستا سایس و ژمارەیەک لە ڕۆژهەلاتناسەکان دەڵێن: زمانی میدی‌یەکان یا ئەم کوردی‌یەی ئێستە بووە، یا بنچینە بووە بۆی.

ئەمە بەتەواوی کۆنی زمانی کوردی دەردەخات، چونکە میدی‌یەکان لە فارسەکان کۆنترن و لە پێش ئەوانیشدا هاتوونەتە وڵاتی فارسەوە و دەوڵەتیان پێکهێناوە. لە سەردەمی حەوتەمی پێش لە دایک بووندا بوو گەورەترین دەوڵەتیان دروست کردو پەردیان سەندو وا بەهێز بوون ساڵی 612 ی پێش لە دایک بوون ناوی دەوڵەتی ئاشووری‌یەکانیان لەناو ناواندا نەهێشت، ئەو دەوڵەتە گرنگەی نیوەی جیهانی لە ژێر دەستدا بوو.

لەو کاتەشدا فارسەکان لە ژێر دەستی میدی‌یەکاندا بوون و وا مانەوە هەتا دەورووبەری ساڵی 550 پێش لە دایک بوون. ئەو کاتەی کۆرشی گەورە پەیدا بوو و توانی فارسەکان لە ژێر چنگی میدی‌یەکان دەربهێنێ و دەوڵەتیان بۆ پێکبهێنێت.

لێرەدا ئەم پرسیارەمان دێتە ڕێ، ئەویش : ئایا ڕێی تێ دەچێ گەلێک بە زمانی گەلێکی تر گفتوگۆ بکات کە ژێر دەستەی خۆی بووبێت؟!!.

گەلێک ئەوەندە کۆن بێت کە 270 ساڵ لەپێش گەلی فارسدا هاتبێتە ئەو ناوچەیەوەو دەوری سەد ساڵێکیش لە پێش ئەواندا دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی هەبووبێ و تەنانەت فارسەکانیشیان لە ژێر دەستدا بووبێ، ئیتر چۆن ڕێی تێ دەچێ بوترێ ئەمان بە زمانی فارسی گفتوگۆیان کردووە!! ئەمە ئەوە دەچێت بڵێیت گەلی تورک لە تورکیادا بە زمانی کوردی‌ی دەدوێن!!.

بەڵێ ئەوا وتمان میدی‌یەکان کە سەرچاوەی گەلی کوردن بە فارسی

ئەدوان، کەواتــــە فارســـــەکان و میدی‌یــەکان هــەردوکیان یــەک گــەل بوون، چونکە زمانیان یەک بووە.

ئەگەر وابوبێت ئەوسا کە ئەم دوو پرسیارە ڕێگەمان لێ ئەگرێت و بەدرۆمان دەخاتەوە

یەکەم: ئەگەر ئەم دوو گەلە یەک بووبن و جیاوازی‌یان نەبوبێت لــە زمانــا ئــەی چــۆن میدی‌یــەکان ماوەیەکی دوورو درێژ فارسەکانیان خستە ژێر دەستی خۆیانەوە؟

دووەم: بۆچــــی فارســــەکان هــەوڵی جیابوونــەوەیان دەدا لــە دەوڵــەتی میدی‌یــەکان بــۆ ئــەوەی دەوڵـــەتێکی نوێـــی ســــەربەخۆ دابمەزرێنن؟

هیچ وەڵامێک نی‌یە لــەوە زیاتر کەبێگومان زمانیان جیاواز بووە لە زمانی میدیو گەلانیش بە زمان و شێوە لێک جیا دەکرێنەوە.

هەروەکو بۆمان دەرکەوت گەلی کورد گەلێک لە فارسەکان کۆنترن، هەروەها زمانیشیان جا ئەگەر ئێمە نەڵێین فارسی لــە کوردی‌یــەوە وەرگیراوە دەسا بیروباوەڕ فرۆشان چۆن ڕووی ئەوەیان هەیە ئێستا وشەی شەرمەزاری‌یان نەبیستووە، لەبەرئەوە درۆ بەلایانەوە هیچ نی‌یە، درۆیەکی وا زلیش کە زمانی کوردی بەو کۆنی‌یەوە بکەن بە زاراوەیەکی فارسی. بەڕاستی ئەمە شتێکە هەر بۆ پێکەنین دەشێت، لــەوە ئــەچێت بڵێیـــت ســـەو بارکـــە کـــوڕی کوڕەکەیەتی، یا ئەو ئافرەتە هەشتا ساڵی‌یە کچی ئەو ژنە بیست ساڵی‌یەیە!

ئینجا سـەرەی ڕۆژهــەڵاتناس مێجەر سۆن کە کورتەی باسەکە دەڵێت: لە ساڵی 401 ی پێش لە دایک بوونەوە. لەو کاتەی زەینەفۆن گــەلی کـــاردۆخی پێگەیشـــت کوردســـتان بـــووە جێ‌نیشـــتەی گەلێکی کۆن کە خاوەنی زمانی تایبەتی‌ی خۆی بووە. ئەم گەلە خۆیان و زمانەکەشیان لە هەموو تێکەڵی‌یەک پاراستووە ئەگەر بێتو کوردی لەگــەڵ هــەر زمانێکی تر بەراورد بکەین دەبینین کورد زمانی خۆی لە هەموو گەلێکی تر زیاتر پاراســـــتووە، بەڕادەیـــــەک جیاوازی‌یەکی زۆر نی‌یە لە نێوان کوردی‌ی ئێستەو کوردی‌ی پێش سەدەها ساڵدا

بەڵێ وەک مێجەر سۆن ئەڵێت گەلی کورد لە هەموو کاتێکدا هۆشی بــە زمانەکــەی خۆیــەوە بــووەو پاراســتریەتی بێگومــان ئــەوەی یــاریدەی داون لــەم پاراســتنەدا سروشــتە. چونکــە کــورد لــە شوێنێکی شاخاوی سەختدا ژیاون؛ لەبەرئــەوە گــەلانی دراوســێیان نــەیانتوانیوە بــە ئاســانی پێوەندی‌یان لەگەڵ پەیدا بکەن و کار بکەنە سەر زمانەکەیان، بە تایبــەتی پێوەنــدی ئــابوری و بازرگانی و سیاسی کە گەورەترین هۆی تێکەڵی زمانن. ئەبوونی ئەو جۆرە پێوەندی‌یانەش گــەورەترین ئەڵقانــە کــە زمــانی کـــوردی‌ی پاراســـتووە و هــەر بــە خــاوێنی ماوەتــەوە ئــەوە ئــەبێت چــەند ووشــەیەکی عــەرەبی‌ی لــە ڕێگــەی دینــەوە تێکەڵ بووە لــە ئــەنجامی بڵاوبوونـــەوەی ئیســـلام لـــە کوردستاندا ســاڵی 18 ی کۆچی، ئەمەش تەنها لــە زمانی کــوردی ڕووی نەداوە، تەنانەت ئێستە ئەگەر زمانی تورکی، یا فارسی پاڵاوتە بکەین نیوەی زیاتری ئەبێت بڕوات چونکە هەمووی وشەی عەرەبی‌یە.

ئێستەش گەلی کورد هەستی بەمە کردووە، بۆیەکا هەموو جۆرە وشەیەکی بێگانــە لــە زمانەکەماندا ڕوو لە فەوتانە. سوکە بەراوردێک لە نێوان هۆنراوەی بوێژە کۆنــەکان و تازەکاندا، یا نووسراوی نووسەرە کۆنەکان و تازەکان ڕاستی ئەمەمان بــۆ دەردەخــات، دەری ئەخــات هـــەنگاوی پـــیرۆزی پـــاڵاوتنی زمانەکەمان لە وشــەی بێگانــە لــە مێژەوە دەستی پێکردووە ئێستاش خەریکە بە ئامانج ئەگات.

کەوا بێت هۆی لەیــەک چوونـی زمانی کوردی و فارسی چی‌یە؟ ئــەوەی گومــانی تێــدا نی‌یــە نزیکی‌یــەکی زۆر هەیــە لــە نێــوان زمانی کــوردی و فارسیدا، بــەڵام ئەمــە وا ناگەیــەنێت کـــوردی زاراوەیەکی فارسی‌یە. ئەبێت چەند هۆیەک هەبێت بۆ ئەم لەیەک چوونە. دەسا با کەمێک وردبینەوە و بزانین ئەو هۆیانە چین.

هەر کەسێک دەربارەی مێژووی کۆنی کوردو جوغرافیای کوردستان شتێک بزانێت ئەتوانێت ئەگەڵما بڵێت هۆی ئەم لەیەک چوونە بۆ دوو شت ئەگەڕێتەوە:

یەکەم: هەردوو زمانی کوردی‌ی و فارسی بەشێکن لە یەک خێزانی زمــانی، ئــەویش خــێزانی زمانــە هیندۆ ئەوروپایی‌یەکانە.

لەبەرئــەوە ئــەبینین لــە یــەک چوونێکی زۆر هەیــە نــەک تەنها لــە نێوان زمانی کوردی و فارسیدا، بەڵکو لە نێوان کوردی و زمانەکانی تریشدا کە لەم خێزانی زمانی‌یەن.

گەلێک ووشە هەن لە فەرەنسی‌و کوردیدا، یا کوردی‌و ئیتالیدا یەک مانا دەبەخشن، وەک پرۆی چاوو ئەرنۆی کوردی و فەرەنسی‌و بــرۆو کیرو کاروانی کوردی‌ی ئیتالی.

جگە لەمانە گەلێک وشەی تریش هــەن لــە نێوان کــوردی‌و ئیتــالی‌و کــوردی فەرەنســی و ئینگلــیزی‌و گەلێک زمانی تر کە لە خێزانی زمانە هیندۆ- ئەوروپایی‌یــەکان لــە یــەک دەچن و یەک ماناش دەبەخشن.. بەڵام ئایا ئەم لەیەک چوونە مانای ئەوەیــە کـــوردی زاراوەیـــەکی فەرەنسی، یا ئیتالی‌یە؟ کەواتــە لەیەک چوونی فارسی‌و کوردیش چەشنی شــتە، هۆکــەی ئەوەیــە هەردوکیان لەیەک خێزانی زمانین.

دووەم: ئاشــکرایە نزیکـــی لـــە نێوان کوردی‌و فارسیدا زۆرترە وەک لــە نێــوان کــوردی‌و زمانــە هینــدۆ- ئەوروپایی‌یــەکانی تــردا، هــۆی ئەمــەش نزیکی‌یـــە لـــە نێـــوان کوردســـتان و ئـــێراندا، ئـــەو نزیکی‌یەی بۆتە هۆی تێکەڵ بوونی چەند وشەیەکی ئەوان لەگەڵ زمانی ئێمەو چەند ووشــەیەکی ئێمــەش لەگــەڵ زمانی ئــەواندا. سەرەڕای ئەمانــەش زۆربــەی هــەردوولا گــەل موسوڵمانن، ئەمەش یەلای کەمەوە بۆتە هــۆی لەیــەک چوونــی زۆربــەی ئەو وشانەی پێوەندی‌یان بە دینەوە هەیە.

جگە لەم دوو هۆیە ئەتوانین بە ئاسانی هۆیــەکی مێژوویــی تریش بدۆزینەوە، چونکە ئەگەر یەکێک لە مێژووی میدی‌یــەکان و چۆنیــەتی فــەوتانی دەوڵەتەکــەیان بکۆڵێتــەوە ئەتوانێت لەگــەڵما هــۆی نزیکــی کــوردی و فارسی بــەم جــۆرە ڕوون بکاتەوە:

دەوروبەری ساڵی 550 ی پێش لەدایک بوون دەوڵەتی میدی پاش جەنگێکی گەورە لە نێوان شای میدی ئیستیاجزو شــای فــارس کورشی گەورەدا فەوتا. بەم جۆرە فارسەکان کە جاران ژێر دەستەی میدی‌یــەکان بـــوون وایـــان لێ هـــات میدی‌یەکانیان کەوتە ژێر دەست. ئــەمانیش کەســەربەخۆیی‌یان ئــەما بەشــی زۆریان بــەرەو شــاخەکانی کوردستان بوونەوە و لەوێ لەگــەڵ گەلانی ئەو ناوە تێکەڵ بوون و گەلی کوردیــان پێکــهێنا. ئینجــا ئــەوی گومانی تێدا نی‌یە تێکەڵی‌یەک لە نێوان ئەم میدی و فارسانەدا پەیدا بوبو، چونکە فارسەکان ماوەیەک لە ژێر دەستی میدی‌یــەکاندا بــوون؛ ئــەمانیش ماوەیــەک لــەژێر دەســتی ئەواندا، بێ گومان ئەو تێکەڵی‌یەش کــاری کردۆتــە ســەر هــەردوو زمانەکەو سوکە لەیەک چوونێکی لە نێوانیاندا پەیدا کردووە.

ژمارەیــەک لــە مێژوونووســان دەربارەی ئەم لەیەک چوونە دەڵێن گەلێک هەبووە ناوی پارتی بووە کە لە گەلە هینــدۆ - ئەوروپی‌یــەکان بوون و بەشێکیان تێکەڵ بە فارس و بەشێکیشیان تێکەڵ بە کــورد بــوون و تیایــاندا تواونەتــەوە، ئەمــەش بۆتــە هــۆی ئــەوەی چــەند وشەیەک لــە زمانەکــەیان تێکەڵ بە فارسی و کوردی ببێت. ئێستەش ئــەو وشــانە بوونەتــە هــۆی پــەیدا کردنی ئــەم لەیــەک چوونــەی نێوان کوردی و فارسی.

پاش ئەم سووکە بەراورد کردن و لێکۆڵینەوەیە لە زمانی کوردی و فارسی بــا ئــەم پرســیارە تــازە بکەینەوە.

ئایــا هــەندێک لــە بیروبــاوەڕ فرۆشــەکان چــۆن ڕووی ئــەوەیان هەیــە بڵێــن کــوردی زمــانێک، یــا زاراوەیــــەکی فارســــی، یــــا بێگانەیە؟!!

دەسا بــۆ دواجاریش وەڵامیــان بدەینەوەو بڵێین: دەریایەکی خاوێن و جــوان ئەگــەر چــی جۆگەیــەکی پیسیشی تێ بڕژێت لیخن نابێت!



# گاڵتەو گەپو گەمەکانی

# نێوان شێخ مەحمودو فڕۆکەوانە ئینگلیزەکان

هەر لەسەرەتاوە ئەڵێم ئەگەر فڕۆکەکانی ئینگلیزو زۆر جار بۆمبابارانی بێوچانیان نەبوایە شێخ مەحمودو لایەنگرانی لەوانە بوو بتوانن بەشی زۆری ئامانجە نەتەوەیی یەکانی کورد جێبەجێ بکەن. بۆ روون کردنەوەی ئەم راستی یە بایەخدارە دەیان بەڵگەو رووداوی هەمە چەشنە بەدەستەوەن کە سەرچاوەکانیان ئینگلیز خۆیانن.

پێم وایە رۆژنامەی "تێگەیشتنی راستی" کە ئینگلیز لە بەغدا رۆژی یەکەمی کانوونی دووەمی ساڵی 1918وە دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی، یەکەم چاپەمەنی یە بەکرمانجی خواروو باسی فڕۆکەو بەتایبەتی باسی فڕۆکەی ئینگلیزی کردووە، فڕۆکەی ناونـاوە کـۆلارە، فڕۆکەوانیش کۆلارەوان. هەر ئەو سەرەتای ساڵی 1918 بۆ یەکەم جار وێنەی فڕۆکەو فڕۆکەوانێکی لە ژمارە یازدەی خۆیدا بڵاوکردۆتەوەو لەژێریدا نووسیویە "کۆلارەوانێکی ئینگلیز کۆلارەکەی پیشانی خەڵک ئەدا". دوای ماوەیەک "تێگەیشتنی راستی" بۆ رۆژگاری خۆی دەربارەی فڕۆکە هەواڵێکی سەیری بڵاوکردۆتەوە، تێیدا دەڵێ جاران "مودەتی سەفەر لە قاهیرە بۆ بەغداد لە بەینی دوو سێ هەفتەدا" بوو بەڵام "کۆلارەیەکی ئینگلیز" تواني ئەو رێگە دوورو درێژە بە "12 سەعاتو 35 دەقیقە گەی" بکات.

"تێگەیشتنی راستی" لەو ریبۆرتاجەشیدا کە دەربارەی ئەو ئاهەنگە نووسیویەتی کە ئینگلیزەکان لە بەغدا بەبۆنەی تەواوبوونی شەڕی یەکەمی جیهانەوە گێڕابوویان باسی فڕۆکەی بەم جۆرە کردووە:

"چەند کۆلارەیەک لە هەوادا دەستیان کرد بەیاری، بەرزو نزم دەبوونەوو تەقەیان لێ ئەداو لە خوارەوە چەپڵەیان بۆ لێئەدان و تەحسینیان ئەکرد.

زۆری ئەبرد کورد بەچاوی خۆیان ئەو "کۆلارە سەیرەیان" لە ئاسمان و زەمینی کوردستاندا بینی. بەوێنە جێگری حاکمی گشتی ی بەریتانیا لەعێراق ئارنۆلدولسن بۆ خۆی و رۆژی یەکی کانوونی یەکەمی ساڵی 1918 بە فڕۆکە هاتە سلێمانی و دیدەنی شێخ مەحمودو ژمارەیەک گەورە پیاوانی کوردی کرد. لەو سەفەرە فڕۆکەیەدا وەک زۆر شتی تر، بووە هۆی ئەوەی کورد لەوە تێبگەن ئینگلیز چەند بەتواناو چەند بەدەسەڵاتن.

لەو رۆژگارەدا وەک مافێکی رەوای خۆی و وەک گەلانی تری رۆژهەڵاتی نزیک و ناوەڕاست کورد سەربەخۆیی دەویست، بەڵام گەلێک هۆی دەرەکی بەرامبەری یەکەم و ناوەکی بەرامبەری دووەم بوونە کۆسپ لەبەردەم جێبەجێ کردنی ئەو ئاواتەدا کە سەرئەنجام وای لێ هات لەگەڵ بەرژەوەندی یەکانی ئینگلیزدا نەگونجێ. لەبەر ئەوە زۆری نەخایاند ئینگلیزو کورد لێک ترازان و بوونە دوو بەرەی ناحەزی دژ بەیەک. بۆیەکا پێکدادان لەنێوانیاندا خۆی داسەپاندو خاکی کوردستان لەکۆتایی ساڵی 1918وە تا ساڵی 1932 بووە شەڕگەیەکی بەرفراوان. لەبەر گەلێک هۆ شێخ مەحمود لەو رۆژگارەدا ببوە رابەری یەکەمی کوردایەتی لە کوردستانی باشوور، بۆیەکا بەشی هەرە زۆری شەڕو پێکدادانەکانی ئەو قۆناغە لەگەڵ هێزەکانی ئەودا قەومان.

شێخ مەحمود سوور بوو لەسەر جێبەجێ کردنی داخوازیەکانی کورد، بۆیەکا دەبوو هەرچۆنێک بێ لەناو ببرێ، خۆ ئەگەر نەیانە نەلوا ئەوساکە هیچ نەبێ لە پەل و پۆ بخرێ، لە وتارێکی تردا گوتومە ئەوە کارێکی ئاسان بوو چونکە "شێخ مەحمود بەشێک بوو لە بزووتنەوەیەکی بەرفراوانی رەوا کە هۆی مان و ژیانی لەبن مافی گەلێکەوە سەرچاوەی وەردەگرت"، سەرباری ئەوە "شاخ و داخی کوردستان ببوونە پەناگەی شێخ و لەشکری میری ئەوە لەباردا نەبوو بتوانێ بزووتنەوەکانی لەناو بەرێ".

لەو بارودۆخەدا ئەرکی سەرەکی ی لەناوبردنی شێخ مەحمود، یا هیچ نەبێ بەربەست کردنی تەشەنەسەندنی بزووتنەوەکانی راستەوخۆ کەوتە ئەستۆی فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی بەریتانیای گەورەوە.

بەهاری ساڵی 1919 بۆ یەکەم جار ئینگلیز فڕۆکەیان دژی کوردی عێراق بەکارهێنا. رۆژی یەکی مایسی ئەو ساڵە لایەنگرانی شێخ مەحمود کتوپڕ رژانە ناو شاری سلێمانی یەوەو لە سووکە شەڕێکدا ئەو هێزەی ئینگلیزیان بەزاند کە بەسەرکردایەتی دانیلس لەوێ بوو، دەستیان بەسەر شاردا گرت و گرینهاوسی جێگری مێجەر سۆن و هەموو یاریدەرەکانیان بەدیل گرتن کە پێنجیان ئەفسەری ئینگلیز بوون، ئینجا بانگی سەربەخۆیی یاندا. هەمان کات لایەنگرانی شێخ، بەتایبەتی جافەکانی سەر بە حامید بەگ، ئابڵوقەی هەڵەبجەیان داو گ. م. لیسی یاریدەری کارگێڕی سیاسی یان لە دەوروبەری شار دابڕی. هەنگاوی داهاتوو بەرەنگاربوونەوەی ئینگلیز بو لە کەرکوک.

لەوساوە ئینگلیزەکان بە فڕۆکە کەوتنە سۆراخی شۆڕشگێڕانی کورد، چەند جارێک هاتنە سەر ئەو ناوچانەی بەدەستیانەوە بوون بۆ تاقیبی ئیازەکانیان و بەسەرکردنەوەو زانینی هەواڵی دیلەکانی خۆیان. لە ئاسمانەوە نامەو بەیاننامەی تایبەتی یان فڕێ ئەدایە خوارێ. یەکێک لەو نامانە بۆ خودی شێخ مەحمود بوو کە تێیدا داوایان لێ کردبوو بۆ گفتوگۆ سەردانی بەغدا بکات. تەنانەت ئارنۆلد ویلسنی جێگری حاکمی گشتی ی عێراق بۆ خۆی بە فڕۆکە هاتە سەر ناوچەکەو بەمجۆرە باسی ئەو هاتنەی بۆ تۆمار کردووین:

"یەکسەر بەفڕۆکە هاتمە ناوچەکە تابە چاوی خۆم ببینم چی روودەدات، هەر شەش ئەفسەرە بەریتانی یەکەم لەسەربانی بەندیخانە کاتی یەکان لە سلێمانی بینی. دوای ئەوە چوومە هەڵەبجە بەو ئیازەی بتوانم دابەزم و لیسی یاریدەری کارگێڕی سیاسی ئەوێ لەگەڵ خۆمدا بهێنمەوە. بەڵام کەمی ئەو بەنزینەی پێمان مابوو بواری جێبەجێ کردنی کارەکەی نەدام هەر ئەوەندەم بۆ کرا نامەیەکی بۆ فڕێ بدەمە خوارێ و داوای لێ بکەم لەوێ نەمێنێ."

بەر لەشەڕی بازیان چەند جارێک فڕۆکەکانی ئینگلیز هاتنە سەر ناوچەی جیا جیای کوردستان هەم بۆ تۆقاندنی خەڵکەکەی ئەبا بدەنە پاڵ شێخ مەحمود، هەم بۆ تاقیبی جەو جوڵی شۆڕشگێڕان. رۆژی هەژدەی حوزەیرانی ساڵی 1919یش کاتێک ئەو شەڕە قەوماو دوای تەواوبوونیشی بەشەکانی کورد فڕۆکە دەوری زۆر نیشانەدەری هێزەکانی ئینگلیزی ئەبینی.

بۆ هەمان مەبەست فڕۆکەی ئینگلیز نیشتە ناوچەکانی بادینانیش. بەتایبەتی دوای ئەوەی بارزانی و زێباری بۆ یەکەم جار لە بەختی کوردا پێکڕا بەرەنگای دوژمن هاتن و پایزی ساڵی 1919 دەستی چاکیان لێ وەشاند. بەپێی "یادداشت" شۆڕشگێڕانی کورد لە نزیک زاخۆوە فڕۆکەیەکیان خستۆتە خوارێ. ئەگەر وابێ ئەوە یەکەم فڕۆکەی شەڕکەری ئینگلیزە لەلایەن شۆڕشگێڕانی کوردەوە بپێکرێ.

لە رۆژانی شۆڕشی بیستیشدا ئینگلیزەکان چەند جارێک فڕۆکەیان ناردە سەر ناوچەی جیاوازی کوردستان بۆ چاوترساندنی دانیشتوانیان. ناوەندی ئەیلولی 1920 دوو فڕۆکەی ئینگلیز بۆمبابارانی بارام ئاواو بەڵخەو چەند گوندێکی تری ناوچەی هەورامانیان کرد بۆ دامرکاندنەوەی دڵی یەکان کە هەمیشە لایەنگری شێخ مەحمود بوون. هەر لەو دەوروبەرەشدا ئارنۆلد ویلسن بەفڕۆکەیەکی تایبەتی هاتە هەولێرو لەوێ کۆبوونەوەیەکی گەورەی سازکرد بۆ هێورکردنەوەی باری ئاڵۆزی شارو دەوروبەری.

بەم جۆرە لەگەڵ داگیرکردنی کوردستانی باشووردا لەلایەن ئینگلیزەوە فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی بەریتانیا بوونە یەکێک لە ئامرازە سەرەکی یەکانی سەرکوت کردنی نیشتمانپەروەرانی کورد. بەپێی قسەی گۆڤاری باوەڕپێکراوی "رۆژهەڵاتی نزیک هندستان"ی لەندەنی ئینگلیزەکان تەنانەت فڕۆکەیان بۆ کۆکردنەوەی باج و سەرانەش بەکارئەهێنا.

بەهۆی پەرەسەندنی خەباتی رزگاریخوازی کوردەوە رۆژ بە رۆژ رۆڵی فڕۆکە جەنگی یەکانی ئینگلیز لە کوردستاندا زیاتر دەبوو ئەم راستی یە لەبەسەرهات و رووداوەکانی رۆژانی قۆناغی دووەمی بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود تەواو خۆ دەنوێنێ. دەبوو ئەو رژێمەی شێخ مەحمود تەشرینی یەکەمی ساڵی 1922 دایمەزراند زوو بەزوو زیندەبەچاڵ بکرێ. رۆڵی فڕۆکەکانی ئینگلیز لەجێبەجێ کردنی ئەو فەرمانەدا گەورە بوو.

ئەمجارەیان لەسەرەتای مانگی مارتی ساڵی 1923 وە فڕۆکە جەنگی یەکانی ئینگلیز لە ئاسمانی

کوردستاندا کەوتنەوە جموجوڵ. دوای ئەوەی کاربەدەستانی میری و ئینگلیز شێخ مەحمودیان پێ قایل نەکرا دەست هەڵگرێ ڕۆژی یەکی مارتی ئەو ساڵە ئینگلیز لە ڕێگەی فڕۆکەکانی خۆیانەوە شێخیان ئاگادار کرد دەبێ بێ دواخستن خۆی و هێزەکانی لە سلێمانی بچنە دەرێ کە شێخ ملی نەدا دوای دوو ڕۆژ فڕۆکە کەوتە بۆمبابارانی شارو ژمارەیەک خەڵکی بێتاوان پێوە بوون. ئەوساکە شێخ مەحمود ناچار بوو بەرەبەیانی چواری مارت بەخۆی و هێزەکانی یەوە بکشێنەوە ناوچەی سورداش و ئەشکەوتی جاسەنەی کردە بنکەی سەرکردایەتی خۆی و لەوێ لە ڕۆژی هەشتی مارتەوە ڕۆژنامەی "بانگی حەق"ی دەرکرد کە بەناوی خۆی بەخۆیەوەیە. داستانی بێهاوتای ئەو ڕۆژنامە ئەگمەنەی کورد و سەرجەمی مێژووی ڕۆژنامە نووسی ناوچەکە و لە ڕاستیشە جیهان بە ئاسانی ئەوە ڕوون ئەکاتەوە بۆچ فڕۆکەکانی ئینگلیز دەستبەرداری شێخ نە ئەبوون. لە ژێر ناوی ڕۆژنامەدا نووسراوە "ناشکێ بە تۆپ و بۆمبا سەرفرازە بانگی حەق". ئینجا نووسراوە بانگی حەق" "غزتەیەکی رەسمی یە لە قەرارگاهی عمومی ئۆردووی کوردستان کە پێ دەکرێ. غایە و ئەمەلی استحصالی حقوقی کوردانە"

فڕۆکەکانی ئینگلیز لێرەش تەنگیان بە شێخ مەحمود هەڵچنی و ناچاریان کرد پەنا بەرێتە بەر گوندی پیران کە کەوتۆتە ناو خاکی کوردستانی ئێرانەوە و دوو میل لە سنوورەوە دوورە. لە پیرانەوە شێخ دژی ئینگلیز یادداشتێکی ئاراستەی گشت ئەو دەوڵەتانە کرد کە باڵیۆز خانەیان لە تاران هەبوو، لەو یادداشتەیدا شێخ مەحمود بە تایبەتی باسی بۆمبابارانی فڕۆکەکانی ئینگلیزی کردووە کە چۆن لەگەڵ هێزەکانی تریاندا تەنگیان بە کورد هەڵچنیوە و بوونەتە هۆی کاول کردنی وڵاتەکە و ئاوارە بوونی نزیکەی دوو صەد سەر خێزانی سلێمانی.

تا ڕۆژی 28ی مایسی ساڵی 1923 هێزەکانی ئینگلیز و میری نەیانتوانی بێنەوە ناو شاری سلێمانی، بۆ ڕۆژی داهاتوو سەرەک وەزیران عەبدولموحسین سەعدون و صەبیح نەشئەت و کۆرنوالیسی ڕاوێژکاری نوێنەری باڵای (المندوب السامی) بەریتانیا لە عێراق گەیشتنە سلێمانی. دوای ئەوان سێر هێنری دۆبسی نوێنەری باڵا بۆ خۆیشی گەیشتە ئەوێ و هەموویان تا ڕۆژی چواری حوزەیران لەوێ مانەوە، بەڵام شتێکی ئەوتۆیان پێ نەکرا بۆ هێمن کردنەوەی باروودۆخی ئاڵۆزی ناوچەکە و یەکێکیان بۆ نەدۆزرایەوە بتوانێ جێگەی شێخ مەحمود بگرێتەوە، بۆیەکا هێزەکانی میری ناچار بوون ڕۆژی حەڤدەی حوزەیران دیسان سلێمانی بەجێبهێڵن، دەست و برد کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەن دەستی بەسەر شاردا گرت و بە ناوی شێخ مەحمودەوە کەوتەوە حوکمڕانی ناوچەکە تا ڕۆژی یازدەی تەمووز شێخ بۆخۆی گەیشتەوە ناو شار. ئینگلیزەکان لە ڕێگەی کەرکوکەوە بە ناوی نوێنەری باڵاوە نامەیەکیان بۆ شێخ نارد، تێیدا هەڕەشەی ئەوەیان لێکردبوو کە ئەگەر بێتوو دەست بخاتە ناو کاروباری ڕانیە و قەڵادزەو چەمچەماڵ و هەڵەبجەو قەرەداغ و سەرگەڵو و ماوەت و سەنگاوەوە ئەوساکە بە توندی لێی ئەدەن.

ئەو هەڕەشەیە دەستی ئەدا لە هەموو سات و ئانێکدا بکرێتە بیانوو بۆ لێدانی شێخ مەحمود ئەگەر چی سەری تەنانەت لە مزگەوتەکەی حاجی کاک ئەحمەدی شێخی باپیریشی دەرنەهێنایە. بە پێی گێڕانەوەی ئێدمۆندسی سەرپەرشتکاری کەرکووک زۆری پێ نەچوو نوێنەرانی هەڵەبجە بە گزادانی جاف بە ڕابەری حامید بەگ و ئەحمەد بەگ و عزەت بەگ بۆخۆیان گەیشتنە سلێمانی بۆ "ڕاگەیاندنی بڕوایان بە مەلیکی کوردستان. زۆربەی دانیشتوانی مەڵبەندە قەدەغەکانی تریش مورید و لایەنگری شێخ بوون و لەبەر گەلێک هۆ لە سلێمانی دائەنیشتن.

ئەمجارەیان ئینگلیز خراپتر پەنایان بردەوە بەر فڕۆکە بۆمباهاوێژەکانیان. بۆ یەکەم جار لە مێژوودا ئەو فڕۆکانە کەوتنە بەکارهێنانی بۆمبای 220 پاوەندی تازە دروست کراو دژی کورد کاولکاریی ئەو فڕۆکانە دیسان بۆ یەکەم جار لە جنێڤ و لۆزان و لەندەن و ئەنقەرە دەنگی دایەوە. پاکانەی ئینگلیز ئەوە بوو گوایە ئەوان بە ناچاری "بۆ پاراستنی هێمنی و ئاسایش" پەنایان بردۆتە بەر ئەو کاولکارییە.

لەم بووارەدا مس بێڵی بەناوبانگ ڕووداوێکی یەکجار سەیری بۆ تۆمار کردووین. خاتوو بێڵ کە ئەوساکە سکرتێری نوێنەری باڵا بوو لە بەغدا و لە هەر کەس زیاتر ئاگاداری کەین و بەینی ئینگلیز بوو لە عێراق دەوروبەری کۆتایی کانوونی یەکەمی ساڵی 1923 بە بۆنەی نزیک کەوتنەوەی کریسمس و جەژنی سەری ساڵی نوێوە نامەیەکی بۆ باوکی ناردووە لە لەندەن. بە دەستووری نامەکانی تری خاتوو بێڵ لەم نامەیەشدا باوکی دەربارەی چالاکییەکانی خۆی و ڕووداوە گرنگەکانی عێراق ئاگادار کردووە لەو نامەیەدا کە بەداخەوە تا ئێستە، بە پێچەوانەی زۆربەی نامەکانی تریەوە، نەکراوە بە عەرەبی باسی ئەوەی کردووە چۆن سەرکردەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عێراق مارشاڵ (موعیب ڕوکن) سێرجۆن سالمۆند ویستوویە سەری شێخ مەحمود بکاتە دیاری دەستی بۆ لەندەن بە بۆنەی جەژنی سەری ساڵی نوێوە، بێڵ دەڵێ:

"بۆ خۆی زۆر بە نهێنی سواری



فڕۆکەکەی بوو ، چووە سەر سلێمانی و هێند دایەزیە خوارێ کە تەنها صەدو پەنجا پێی مابوو بدا لە زەوی ،ماڵی شێخ مەحمودی دەستنیشان کرد و ژمارەیەکی بێ شوومار بۆمبای تێگرت ، بە دڵ خۆشی گەڕایەوە چونکە پێی وابوو ئەو گەوجەی گۆڕبەگۆڕ کردووە ".

خاتوو بێل لە نامەکەی دا دەڵێ شێخ مەحمود بۆخۆی رۆژی داهاتوو بە بروسکە بەغدای ئاگادار کردووە کە لە سایەی خواوە "تەندروستی باشەو تڕناگات بۆچی سلێمانیمان بۆمباباران کرد" شایانی باسە یەکێک لە بۆمباکان دەروازەی دەردەوەی ماڵی شێخی هەڵتەکاندبوو . زۆری تەبرە ئینگلیزەکان لەوەیش خراپتریان کرد . رۆژی بیستی مایسی سالی 1924 بە فڕۆکە بەیاننامەیەکی زۆریان بەسەر گەلێک ناوچەی کوردستاندا بڵاو کردەوە، بەیاننامەی ئەمجارەیان دەڵێ هەموو ئەو ناوچانەی سەر بە شێخ مەحمودن بۆمباباران دەکرێن. پاش دوو رۆژ دیسان بە بەیاننامەی تایبەتی خودی شێخیان ئاگادار کرد کە دەبێ خۆی و چەکدارەکانی تا رۆژی بیست و پێنجی مایس شاری سلێمانی چۆڵ کەن . لەو رۆژەدا فڕۆکەکانی ئینگلیز بە خەستی بۆمبا بارانی شاریان کرد ؛ بە رادەیەک ، وەک خۆیان لە راپۆرتی ئەو ساڵەیاندا کە دەربارەی عێراق داویانەتە "کۆمەڵەی نەتەوەکان" (عصبە الأمم) دانیان پێدا ناوە ، لە ناو شاردا تەنها 700 کەس ماونەتەوە ،ئەو باقی خەڵکەکە ، واتە بەلای کەمەوە 19 هەزارو 300 کەس پەرەوازە بوون و "پاش چوار مانگ ئینجا ژمارەی دانیشتوانی سلێمانی دیسان گەیشتۆتەوە دۆخەکەی جارانی ".

هەر لە سەرەتاوە شۆڕشگێڕانی کورد بەپرتەوە کۆنەکانیان دەسرێژیان لە فڕۆکەی دوژمن دەکرد و جارو بار لێیان دەپێکان ؛ جاری واش هەبوو فڕۆکە جەنگیەکانی ئینگلیز بۆخۆیان پەکیان دەکەوت و دەکەوتنە خوارەوە کە ئەویش بەڵگەیەکی تری زۆر بەکارهێنانی فڕۆکە بوو دژی کورد . بە وێنە دەوروبەری کۆتایی کانوونی یەکەمی سالی 1923 دو فڕۆکەی بۆمبا هاوێژی ئینگلیز لە یەک کاتدا کەوتنە خوارێ ، یەکێکیان لە سەرچنار و ئەوی تریان لە تاسلوجە ، ئەمەی تاسلوجەیان پیاوەکانی کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند لە داخی دڵی خۆیان پارچەپارچەیان کرد . رۆژی بیستویەکی نیسانی سالی 1924یش فڕۆکەیەکی تری ئینگلیز لە کاتی نیشتنەوەیدا لە هەڵەبجە تەقیەوە . بەر لەوەیش بە مانگێک و چەند رۆژێک سێ فڕۆکەی جەنگی هاتنە سەر شەمیرانی نزیک وارماوە، گوللەی شۆڕشگێڕانی ئەو ناوچەیە تەنکی بەنزینی یەکێکیانی پێکاو فڕۆکەوانەکەی ناچار بوو بنیشێتەوە.

تۆ بڵێی لەو 34 ملیۆن کیلۆ مەتری چوارگۆشەیەی ژێر دەستیان دا ئینگلیز لەو رۆژگارەدا لە هیچ شوێنێکی تر بەو رادە فراوانەی کوردستان فڕۆکەی جەنگیان بەکار هێنا بێ . هەر ئیدمۆندس کە بۆخۆی فڕۆکەوان بوو لە سالی 1924 جارێکیان لە ماوەی دوو مانگدا 30 جار بە فڕۆکە چۆتە سەر ناوچەی جیا جیای کوردستان لە گەڵ ئەوەشدا فڕۆکە دادی ئینگلیزی نەدا ، شێخ مەحمود دەستی هەڵنەگرت . ئەوساکە ئینگلیز پەنایان بردە بەر پیلانێکی سەیر بۆ کوشتنی شێخ مەحمود وبۆ ئەو مەبەستە بە سەرپەرشتی خودی نوێنەری بالا هێنری دۆبس و بەشداری سەرەک وەزیران یاسین هاشمی رۆژی دووی مایسی سالی 1925 لە کەرکوک کۆنگرەیەکی بەرزیان ساز کردو پارەیەکی زۆر و هێزێکی تایبەتی‌یان تەرخان کرد.

بەر لەوەی گەشتەکەمان لەگەڵ فڕۆکە جەنگیەکانی ئینگلیزو کورددا تەواو بکەین پێم باشە وەک بەڵگەی بێ ئاگایی بە تایبەتی زۆربەی هەرە زۆری مێژوونووسانی عەرەب لێرەدا نمونەیەکی لەبار بهێنمەوە . بۆ ئەم لایەنەی باسەکەمان پەنا دەبەمە بەر بۆچوونی مێژوونووسێکی رێکو پێکو بەڕێز دوکتور نوری عەبدولحەمید خەلیل عانی لە لێکۆڵینەوەیەکی پڕبایەخی زانستییانەی خۆیدا دەربارەی نەوتی عێراق ئەو هەموو کالەیەی ئینگلیز بە شێخ مەحمودیان کرد دەیانخەنە لاوەو سووکو بارێک شێخ دەکاتە داردەستی ئینگلیز، گوایە ئەوان کاتی خۆی رێگەیان داوە هێزەکانی میری لە سلێمانی وەدەرنێ لە کاتێکدا، وەک دەڵێ: "هێزی ئاسمانی زۆر پێویست بوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم جۆرە بزوتنەوانە" بەپێی بۆچوونی ئەو ئینگلیزەکان ئەمەیان بۆیە کرد بەغدا ناچار بکەن مافی دەرهێنانی ئەوتیان بداتێ . بۆ چەسپاندنی ئەو بیرەی دوکتور نوری لەشوێنێکی تری کتێبەکەیدا دەڵێ دوای ئەوەی ئینگلیزەکان بەمەرامی خۆیان گەیشتن و رۆژی چواردەی مارتی سالی 1925 ئیمزای ئەوتەکەیان وەرگرت ئەو ساکە "هێزی ئاسمانی بەریتانی لەعێراق هێرشی گشتی‌ی کردە سەر لایەنگرانی شێخ مەحمود لە پاکوون".

بەلام ئەوی راستی بێ لەو رۆژانەدا کە دکتور باسیان دەکا فڕۆکە جەنگیەکانی ئینگلیز لە ئاسمانی کوردستاندا تا رادەیەکی زۆر لە جوو جوڵ کەوتبوون. لەناو فایلە تایبەتییەکاندا ئەو راستییە روون و ئاشکرایە. لەسەرەتای پایزی سالی 1925ەوە فڕۆکەکانی ئینگلیز دیسان بەخەستی کەوتنەوە راوە کورد، بە تایبەتی رابەرە لێهاتووەکانی هێزە چەکدارەکانی شێخ مەحمودو لە سەروو هەموشیانەوە کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندو سایری کوڕی کەوا دیارە لەو رۆژانەدا وەجاخی باوو باپیرانی بەشیاوی روون کردبووە.

بەپێی بۆچوونی دوکتور نوری و ئەوانەی وەک ئەو دەروانە مەسەلەی کوردو بزوتنەوەکانی شێخ مەحمود بە تایبەتی، دەبوو دوای دانی ئیمتیازی نەوت ئیتر ئیشتمانپەروانی کورد دەسەوەسان دانیشن و دەست لە خەباتی رەوایان هەڵگرن. کەچی بەپێچەوانەوە کوردایەتی رۆژ بە رۆژ زیاتر پەل دەهاویشت. لێرەدا چەند نمونەیەکی مانادار دەخەمە بەرچاو، چونکە وەک دوکتور دەڵێ، راستیش دەکات، ئینگلیز دەیانویست ئیتر ناوچەکە هێمن و هێور بێ تا کۆمپانیای نەوت لە کەرکوک لە بارێکی ئاساییدا بکەوێتەکار، کەچی ئەوەتا چالاکییەکانی لایەنگرانی شێخ مەحمود دوای دانی ئیمتیازی نەوتەکە راستەوخۆ دەگەنە بن دەستی ئەو کۆمپانیایە. لە بەواری سەرکوت کردنی کوردا و لەو رۆژانەدا میری مەجید یەعقوبی کردبووە موتەسەریف (پارێزگار)ی کەرکوک کە وەک باوەکوشتەی شێخ مەحمود وابوو. بەپێی گێڕانەوەی بەڵگەنامە تایبەتییەکانی ئینگلیز ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا چالاکییەکانی لایەنگرانی شێخ لەو ناوچەیەدا تا دەهات، زیاتر پەرەیان دەسەند، ئینگلیز مەترسی‌ی ئەوەیان لێ نیشتبوو هێرش بەرنە سەر هێڵی شەمەندەفەری نێوان بەغدا و کەرکوک، لەبەر ئەوە ناوچەکەیان خستبووە ژێر چاودێری وردی فڕۆکەکانیانەوە. بروسکەیەکی تایبەتی سەرپەرشتکاری کەرکوک کە رۆژی بیستی ئەیلولی سالی 1925 ناردویە بۆ وەزارەتی کاروباری ناوخۆ و نوێنەری بالاو یەکەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عێراق باسی "هێزێکی گەورەی دوژمن دەکات کە پۆلیسی کفری‌ی ناچار کردووە لەشار دەرچن" پاش چوار رۆژ بروسکەیەکی تر باسی ئەوە دەکات چۆن شۆڕشگێڕان هێڵی تەلەفۆنی نێوان کەرکوک چەمچەماڵیان بڕیوە، ژمارەیەکی زۆر لە بروسکەکانی سەرپەرشتکاری کەرکوک باسی ئەو دەردە سەرییە دەکەن کە لەو رۆژانەدا قافلەیەکی گەورەی چەلەو تفاقی لەشکر دووچاری بووە چۆن سوارەی شێخ هەرکە لەشار دەرچووە داویانەتە بەسەریاو چەند رۆژێک لە رێگە گیریان کردووەو دوای مەینەتی‌یەکی زۆر بە یارمەتی فڕۆکە دەربازبووە، سەیر ئەوەیە جاروبار لایەنگرانی شێخ مەحمود زیاتر لەو ئاوانەدا بەجلو بەرگی خاکی‌یەوە دەبینران، هەڵبەت ئەوە نیشانەی زیاتر رێکخستنی ریزەکانی شۆڕشگێڕانە. ژمارەیەک لە مۆرەکانی نزیک کانە نەوتەکانی کۆدە (باج)یان دەدایە شێخ مەحمود نەک میری. کارگەیشت بەوەی سایری کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند ئاگاداری‌ی تایبەتی بەناو دانیشتوانی قەرەحەسەن و گوندەکانی دەوروبەریدا بڵاوبکاتەوە. سەرپەرشتکاری کەرکوک ئیدمۆندس رۆژی 20ی ئەیلولی سالی 1925 دەقی ئاوەرۆکی ئەو ئاگاداری‌یەی ناردووە بۆ راوێژکاری وەزارەتی کاروباری ناوخۆ کۆرنواڵیس و وێنەی داوە بە سکرتێری هێنری دۆبسی نوێنەری بالا لە بەغدا. سەرەتای ئاگاداری‌یەکە بەم جۆرەیە:

"بۆ گشت دانیشتوانی قەرەحەسەن. ئاگادارتان دەکەم کە من سایر بەگی کوڕی کەریمی فەتاح بەگم لەلایەن مەلیکی کوردستانەوە نێردراوم، ئەو هێزەی لە گەڵمدایە بریتی‌یە لە 300 سوارە، لەهیچ مەترسن، من بۆ کۆکردنەوەی کۆدە– باج هاتووم".

لە کۆتاییشدا دەڵێ: "ئەم راگەیاندنەم گوندناو گوند بنێرن تا دەگاتە کەرکوک. ئیمزا: محمد سابیر، فەرماندەی بەتالیۆنی کوردستان".

لە هەمووی پڕماناتر ئەوەیە کە مەجید یەعقوبی نامەیەکی هەڕەشەی تایبەتی‌ی لە کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەندو سەید ئەحمەدی جەباری‌یەوە بۆ هاتووە کە تێیدا ئاگاداریان کردووە بێتو شار بەجێ نەهێڵێ ئەیکوژن. مەجید یەعقوبی لە ئاوا بە خاوو خێزانەوە رۆژی 21ی ئەیلولی سالی 1925

کەرکوکی بەجێ هێشتو بە پەلەپرووزکێ گەیشتە بەغدا.

ئەم جۆرە هەڵوێستانە خوێنی کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندو سابیری کوڕیان لای ئینگلیز کردە کاسەوە. بە رادەیەك بەتایبەتی بۆ کوشتنیان بە فڕۆکە کەوتنە تاقیبی هەردووکیان. ئەمە دەقی بروسکەیەکی بنکەی هێزی ئاسمانی بەریتانییە لە سلێمانی کە رۆژی 26ی ئەیلولی سالی 1925 لەو بارەیەوە داویە بە فەرماندەی هێزی ئاسمانی بەریتانی بەغدا:

"چالاکییەکی فڕۆکەوانی: سەعات پێنج و چل و پێنج دەقیقە بەکاتی ناوخۆ پێنج فڕۆکە چونە سەر خانەقین و ناوچەی رووباری تانجەرۆ بۆ گەران بەدووی کەریمی فەتاح بەگو سابیردا. هیچ وەدی نەکرا. سەعات حەفدەو نیو بەکاتی ناوخۆ سێ فڕۆکەی تر چوونە سەر کانی کوڵەو جێشانەو هەزارمێرد دیسان بۆ گەران بەدووی کەریمی فەتاح بەگو سابیردا. لەهەزار مێرد سێ ئەسپ بینران. دەسرێژیان لێ کراو یەکێکیان پێوە بوو"

با بێینەوە سەر باسەکەی خۆمان. واتە گاڵتەو گەپو گەمەکانی شێخ مەحمودو فڕۆکەوانە ئینگلیزەکان. قۆناغی نوێی پڕ تەوژمی هێرشی فڕۆکە جەنگییەکانی ئینگلیز بۆ سەر لایەنگرانی شێخ مەحمود لە پاییزی سالی 1930وە دەستی پێکرد. دوای راپەرینەکەی شەشی ئەیلولی ئەو ساڵەی سلێمانی بەماوەیەکی کەم شێخ هاتەوە مەیدان. لەو رۆژگارەدا لەبەر کەلێك هەل بزوتنەوەی کوردایەتی پێی نابووە ناو قۆناغێکی گرنگەوە. ژمارەیەك رێکخراوی نوێ دامەزرێنرا؛ لەسەرانسەری ناوچەکانی کوردستانەوە بە دەیان بروسکە بۆ داوای مافی کورد ئاراستەی بەغداو لەندەنو "کۆمەڵەی نەتەوەکان" (عصبە الأمم) کرا. بەصەدان بەڵگەنامەی نهێنی ئینگلیز بۆ ئەو باسە تەرخان کراون.

ئەم دیاردەیە ئینگلیزی تەواو شڵەژاند. بەپێی بەڵگەنامە تایبەتییەکانی خۆیان ئەوان لەوە ترسابوون بادینان و سۆران دەست بخەنە ناو دەستو لە یەك کاتدا بۆ داوای مافی کورد راپەڕن؛ ئەوان ئاگاداری ئەوە بوون کە شێخ مەحمود بۆ ئەو مەبەستە پێوەندیی بە شێخ ئەحمەدەوە کردووە؛ بۆیەکا کەوتنە پیلان گێڕان بۆ دوور خستنەوەی ئەو دوو مەڵبەندە لەیەکتر. بەڵگەنامەکانی ئەو رۆژگارەی وەزارەتی موستەعمرات باسی ئەو بڕیارە تایبەتییانە دەکەن کە "کاربەدەستانی خاوەن پایەو مەقام" لە بەغدا دەربارەی ئەوە دەریانکردووە کە نابێ بەهیچ جۆر رێگە بدرێ هێزە چەکدارەکانی میری لە بەرزان، نە لە پشدەر "تا دیارکردنی سەرئەنجامی شێخ مەحمود" دەست بەکاربن.

لەوەیش گرنگتر کاربەدەستە گەورەکانی ئینگلیز لە عێراق بۆ خۆیان رۆژی سیازدەی کانوونی دووەمی سالی 1931 کۆنفرانسێکی تایبەتییان لە بارەگای نوێنەری بالا لە بەغدا سازکرد بۆ لێکۆڵینەوە لەو رێبازەی دەبێ بۆ دامرکاندنەوەی راپەرینەکانی شێخ مەحمود بیگرنە بەر. بەشدارانی کۆنفرانسەکە بۆ وەدی هێنانی ئەو مەبەستە حەوت بڕیاری سەرەکییان دەرکرد دوائیان، یەکەم و پێنجەمیان، بۆ هەمان مەبەست تەرخان کراون. دەقی بڕیاری یەکەمی کۆنفرانسەکە بەم جۆرەیە:

"1-بێ ئەندازە پێویستە (urgentlynecesesry) لەمارەی دو مانگی داهاتوودا هەموو هەنگاوێکی سیاسیو سەربازی بنرێ بۆ کەمکردنەوەی مەترسیی ئەوەی شێخ مەحمود بتوانێ پشتگیریی زیاتر وەدەست بهێنێ. ئەبا بەهاری داهاتوو راپەرینێکی بەرفراوان هەموو کوردستان بگرێتەوە"

دەقی بڕیاری پێنجەم ئەو مەبەستەی باشتر روون کردتەوە: "5-حوکمەتی عیراقی دەبێ بزانێ تا مسۆگەر کردنی بێ وەیی شێخ مەحمود حوکمەتی خاوەن شکۆی بەریتانیا رازی نابێ هیچ کارێکی سەربازی دژی شێخی بارزان، یا بۆ مەسەلەی دامەزراندنی دەسەڵاتی میری لە ناوچەی پشدەردا ئەنجام بدرێ". هەڵبەت کارێکی لەو جۆرە دەبووە هۆی ئەوەی ئەو دوو مەڵبەندە بەهێزە بدەنە پاڵ شێخ مەحمودو بەو جۆرە ئەوەی ئینگلیز لێی دەترسان دەقەوما، واتە راپەرینێکی سەرانسەری لە هەموو کوردستانی باشووردا بەهاری سالی 1931 بەرپادەبوو.

فڕۆکە جەنگییەکانی هێزی ئاسمانی بەریتانیا لە عێراق رۆڵی یەکەمیان بینی لەو ئەخشە ور ەی ئینگلیزداو لە دامرکاندنەوەی دوا قۆناغی بزوتنەوەکانی شێخ مەحمود، وەك وتمان، لەدوای شەشی رەشی ئەیلولەوە دەستی پێکرد. ژمارەیەکی یەکجار زۆر بەڵگەی سەیرو عەمە چەشنە بۆ سەلماندنی ئەم راستییە مێژوویییە بە دەستەوەن، وا لێرەدا نمونەی ژمارەیەکی کەمیان دەخەینە بەرچاو.

با هەر بە کۆنفرانسەکەی رۆژی سیازدەی کانوونی دووەمی سالی 1931 خۆی دەست پێ بکەین. لەو کۆنفرانسە بالایەدا جگە لەسێر هەمفرێزی نوێنەری بالا نۆ کاربەدەستی گەورەی تری ئینگلیز بەشدارییان تێیدا کرد. پێنجیان، واتە لە نیوەیان زیاتر، نوێنەری هێزی ئاسمانی بەریتانیا بوون لە عێراق. یەکەمیان خودی سەرکردەی ئەو هێزە بوو، ئەوانی تریان بریتی بوون لە سەرپۆل (قائد السرب) بەرێنتو سەرپۆل کۆرتنیو جەنەراڵ براونو کاپتەن رید. بەرێنتو کۆرتنی، وەك دواییش باسی دەکەین، لەو فڕۆکەوانانەن کە حەشریان بە کورد کرد. شایانی باسە سێرکێنهان کۆرۆنوالیس کە دوایی تا سالی 1935 بووە راوێژکاری وەزارەتی کاروباری ناوخۆو پاش ماوەیەکیش بووە بەناوبانگترین بالیۆزی بەریتانی لە عێراق یەکێك بوو لە بەشدارانی ئەو کۆنفرانسە.

شێخ مەحمود ملی نەدا، پێی لەسەر دابین کردنی مافە رەواکانی کورد داگرت. لە وەڵامدا بۆمباهاوێژەکانی ئینگلیز گاڵتەیەکیان بەکورد کرد تا ئەو رۆژە، بێ کەمو زۆر، مێژووی گەلان لە وێنەی بەخۆیەوە نەدیبوو. هەرچەندە سەرەتا بڕیار وابوو تا بەهار دادێو کەشو هەوا خۆش دەبێ ئینگلیز فڕۆکە نەنێرنە سەر لایەنگرانی شێخ، بەلام وا پێ دەچێ دانیان بەخۆیاندا نەگرتو گەلێك لەوەی بڕیار بوو زووتر دوا مۆدیلی بۆمباهاوێژەکەم وێنەکانیان لە جیهان بەردایە گیانی کوردو خاکی کوردستان. هەر لە سەرەتاشەوە جاروبار، نەك هەمیشە، دەستیان لە خەڵکی شەرنەکەریش نەدەپاراست. بەپێی بەڵگەنامەکانی خۆیان هێشتا چلەی زستان بوو کاتێك فڕۆکە جەنگییەکانیان تەنها رۆژی 24ی کانوونی دووەمی سالی 1931 لە دوو جێگە پەلاماری هێزەکانی شێخ مەحمودیان داو بۆمباکانیان بوونە هۆی کوشتنی چەکدارێکو بریندار بوونی شەش چەکداری تر، وێرای بریندار بوونی پێنج کەسی بێ لایەن لە دانیشتوانی یەکێك لە گوندەکان ناوچەکە. هەر لەوساوە ئینگلیزەکان ژمارەیەکی زۆر فڕۆکەیان لەپۆلی سیو پەنجاو پێنج لە کەرکوكو سلێمانیو هەڵەبجە بۆ لێدانی لایەنگرانی شێخ مەحمود تەرخان کرد. رۆژی شەشی کانوونی دووەمی سالی 1931 شێخ مەحمود نامەیەکی تایبەتی ئاراستەی نوێنەری بالاکرد لە بەغدا کە تێیدا "ناڕەزایی خۆی بەرامبەر بە بەکارهێنانی فڕۆکەی ئینگلیز دژی کورد دەربڕیبوو".

فایلە تایبەتییەکانی وەزارەتی موستەعمەراتو هەندەرانو هێزی ئاسمانیی بەریتانیایە نمونەی لەو بابەتەی هێرشی فڕۆکە جەنگییەکانی ئینگلیز ناخنراون کە دەتوانین گەلێکیان لێ بخەینە بەرچاو، بەلام کورد واتەنی مشتێك نمونەی خەروارێکە. لەو مشتەش بە تایبەتی ئەم بروسکەیەی نوێنەری بالا هەلدەبژێرم کە رۆژی 9ی مارتی سالی 1931 ناردوویە بۆ وەزیری موستەعمرات لە لەندەن.

دەقی ناوەرۆکی بروسکەکە بەم جۆرەیە:

"بروسکە لە نوێنەری بالاوە لە عێراق بۆ وەزارەتی موستەعمرات. رۆژی 9ی مارتی 1931 کاتی گەیشتن (بە لەندەن) سەعات 4.30ی پاش نیوەڕۆی 10ی مارتی 1931. ژمارە 132. کاتێك فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی پاشایی (مەلەکی) بە کاری پشکنینەوە خەریك بوو، لە ناوچەیەکدا کە 20 میل لە باشووری رۆژهەلاتی سلێمانییەوە دوورە بەر دەسرێژی یاخی گەران کەوتن. فڕۆکەکانیش لە ئاسمانەوە لێیان هاتنە دەستو چوار هەزار گوللە رەشاشو 25 بۆمبایان تێ گرتن. ژمارەی یاخی گەرەکان خۆی لە 400 سوارە دەدا کە سەرجەمیان بلاوەیان لێکرد. بەپێی ئەو راپۆرتانەی کە پێمان گەیشتوون چەند زیانێکیان لێ کەوتووە. دەڵێن شێخ مەحمود بۆخۆی لەگەڵ ئەو تاقمەدا بووە. رۆژی 9ی مارتیش 5 میل لەولای قەرەداغەوە پێکدادانێکی تر لە ئاسمانەوە لەگەڵ دەستەیەك سوارەی تر رووی دا کە ژمارەیان 80 کەس دەبوو. لەبەر ئەوە لەوانەیە هۆزی جاف مەیلی هەبێ بداتە پاڵ شێخ مەحمود رۆژی 8ی مارت بە فڕۆکە بەیاننامەی تایبەتی بەسەرئەنداماتی ئەو هۆزەدا بلاوکرایەوە کە تێیدا هەڕەشەیان لێ کردوون ئەگەر بدەنە پاڵ شێخ مەحمود"

ناوەرۆکی ئەم بروسکەیە بە تەنها بۆی هەیە مەبەستی گشت لایەنە سەرەکییەکانی باسەکەمان بۆ روون بکاتەوە؛ بە تایبەتی بەرفراوانی راپەرینەکەی شێخ مەحمودو ئازایی لایەنگرانیو لەسەرروو هەموویشیانەوە رۆڵی گەورەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لەلێدانی ئەو راپەرینەو سەرکوت کردنی کوردا.

فشاری فرۆکەکانی ئینگلیزو هێزەکانی میری رادەی بۆ تەشەنە سەندنی راپەرینەکەی شێخ مەحمود دانەنا، لە سەرەتای بەهارەوە ئاگری ئەو راپەرینە بە جۆرێکی بەرفراوان گەیشتە دەوروبەری خانەقینیش. لێرە، بەپێی گێرانەوەی بەڵگەنامەکانی ئینگلیز، هۆزی شەرەف بەیانیو "کۆمەڵەی پاراستنی مافی کوردان" دەوری گەورەیان دەبینی. جافو هەمەوەندی دەوروبەری کەرکوکیش بەجارێك خرۆشابوون.

لەو بارودۆخەدا دەبوو بۆمباهاوێژەکانی ئینگلیز گورزی توندتر لە شۆڕشگێڕانی کورد بوەشێنن. لێرەشدا تاکە بەڵگەیەکی ئینگلیزەکان خۆیان دێنمەوە. ئێوارەی رۆژی بیستو دووی مارتی سالی 1931 گەورە لێپرسراوانی ئینگلیز لە عێراق بەرایەری نوێنەری بالا سێرفرانسیس هەمفریز کۆنفرانسێکی تایبەتیی تریان سازکرد. بەڵگەنامەیەکی نهێنیی وەزارەتی موستەعمەرات باسی ئەو کۆنفرانسەی وا بۆ تۆمار کردووین:

"ئێوارەی رۆژی بیستو دووی مارت لە بارەگای نوێنەری بالا (لە بەغدا) کۆنفرانسێك سازکرا کە تێیدا بەنیازی بەربەست کردنی تەشەنەسەندنی ئەو بزوتنەوەیەی شێخ مەحمود رایەری دەکاتو بۆ ئەوەی نەهێڵرێ یاخی بووان لەگەل نزیك کەوتنەوەی فرۆکەکاندا پەنابەرنە بەر گوندەکان، بڕیار درا فرۆکە دژی ئەو گوندانە بەکار بهێنرێ کە دالدەی یاخیەکان دەدەن. بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارە بڕیاردرا بە فرۆکە بەیاننامە بەسەر ئەو گوندانەدا بلاو بکرێتەوە کە کەوتوونەتە ناوچە یاخیەکانەوەو پێیان رابگەیەنرێ ئەو گوندانەی دالدەی شێخ مەحمود یا لایەنگرانی دەدەن خۆیان توعەرەزی بۆمباباران دەکەن دوای نیو سەعات لەوەی کە لە ئاسمانەوە ئاگاری یان بەسەردا بلاودەکرێتەوە. ئاوەرۆکی ئەو ئاگاداری یەش بەم جۆرەی لای خوارەوە دیاری کرا:

1-لەبەر ئەوەی شێخ مەحمودو لایەنگرانی بەیاخی بوون ئاوانبار کراون، ئەوا ئەو گوندانەی دالدەی خۆی یا لایەنگرانی ئەدەن خۆیان توعەرەزی بۆمباباران ئەکەن دوای نیو سەعات لەوەی لە ئاسمانەوە ئاگادار ئەکرێن.

2-لەبەر ئەوەی ئاگادار کران ئەو گوندانەی دالدەی یاخی بووانیان داوە بۆمباباران دەکرێن واپێتان رادەگەیەنین کە پاش نیو سەعاتی تر گوندەکەتان بۆمباباران دەکرێ.

دوایی دەقی ئاوەرۆکی خالی دووەمی ئاگاداری یەکەمان گۆڕیو وەك لای خوارەوەمان لێ کرد:

گوندەکەتان پاش نیو سەعاتی تر بۆمباباران ئەکرێ، لەبەر ئەوەی ئەسیحەتتان ئەکەین کە هەمووتان بەپیرو پیرێژنو مندالەوە بەر لەوەی بۆمبابارانەکە دەست پێ بکات گوندەکەتان جێ هێلن.

فرۆکە جەنگی یەکانی ئینگلیز دەستوبرد بە جۆرێکی بەرفراوان کەوتنە جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی ئەو کۆنفرانسە. لێرەشدا چەند نمونەیەکی کەم دەخەمە بەرچاو. لە یەکەم رۆژی دوایی کۆنفرانسەکەوە، واتە لەرۆژی بیستو سێی مارتەوە بۆمباهاوێژەکانی ئینگلیز بۆ ماوەی چەند رۆژێك لەسەریەك کەوتنە گیانی گوندو شارۆچکەکانی دەوروبەری خانەقین، بەتایبەتی مزرینو شێخانو کانی کرمانجو شاهوازیو باخ هەنارو پێلولەی قۆرەتوو گوندەکانی عوسمان بەگی سەرەك هۆزی شەرەك بەیانیو چیای سورخو ناوچەکانی سەر روباری عەبباسان. ژمارەیەك لەو گوندانە کاول کران. بەلایەنی کەمەوە سێ کەسیش لەوانە کوژران کە وادیارە لەبەر هەر هۆیەك بو بێ وەك خەڵکەکەی تر گوندەکانیان بەجێ نەهێشتووە. رۆژی سێی مارتیش ژمارەیەك لەو گوندانە بۆمبابار ان کران کە کەوتوونەتە باشووری دامێنی زنجیرە چیای قەرەداغەوە. بەپێی گێرانەوەی بەڵگەنامەکانی ئینگلیز خۆیان فرۆکەکانیان بە تەنها ئەو رۆژە 99 بۆمبی 20 پاوەنیو 5200 گوللە رەشاشیان گرتۆتە تەنها سیان لەو گوندانەی باشووری قەرەداغ. هەر لەو رۆژانەدا کنگرەباتیش کرایە بنکەیەکی تری فرۆکە جەنگی یەکانی ئینگلیز.

ئەمانەش زۆر دادی ئینگلیزو میری یان ئەدا. بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە چەند برێك لەو راپۆرتە دوورو درێژە تایبەتی یە دێنمەوە کە سەرکردەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لەعێراق دەربارەی راپەرینەکەی ئەو رۆژگارەی شێخ مەحمود دایناوە. ئەو بەشەی راپۆرتەکە باسی ئالۆ گۆڕەکانی بەهاری سالی 1931ی راپەرینەکەی بەم جۆرە دەکات:

"لەگەل ئەو هەموو کارانەشدا (واتە کاری بەردەوامی فرۆکەو لەشکر-ك م) هێشتا بارودۆخەکە زۆر ئالۆزبوو، بەرادەیەکی ترسناك کڵپەی سەندبوو. شێخ مەحمود هەموو توانای بۆ بلاوکردنەوەو پەرەپێدانی دەسەلاتی خۆی بەکار هێنا. لە راستیشدا چەند بەڵگەیەك لە ئارادا بوون دەربارەی ئەوەی کۆششەکەی لە پتر لەناوچەیەك بەفیرۆ نەچووبوو. دیاردەی زۆر هەبوو وایان دەردەخست کەوا خەریکە بارودۆخەکە بەلای باشیدا بۆ ئەو بشکێتەوە. مەترسی ی راستەقینە خۆی نواند، خەریك بوو شۆڕش بلاوبێتەوەو پەرە بسێنێ بۆ شتێکی ترسناکتر لەوەی بریتی بێ تەنها لە چالاکی ی پەرەوازەی دەستەیەکی بچووکی یاخیبوو لەناو شاخەکانی ئەودیوی سلێمانیدا"

بەرفراوانی راپەرینی نوێی شێخ مەحمود گەیشتە رادەیەك رۆژی 28ی مارتی سالی 1931 سەعە صالحی بەئاوبانگ لەناو هۆلی پەرلەماندا هاواری لێ هەلسێو بلێ:

"بەر لەهەر شتێکی تر دەبێ لەدەست شێخ مەحمود قوتاربین، ئەگەر دەرەقەتی نایەین ئەوا پێویستە سەربەخۆیی بدەینێ، ئەگەر دەرەقەتیشی دێین ئەوا پێویستە یەکجارەکی لەناوی بەرین. ئەمە مەسەلەی ژیانی ولاتە، یا دەبێ بتوانین شێخ مەحمود لەناوبەرین، یا دەبێ ئەو مافانەی پێ بدەین کە داوایان دەکات".

بەوجۆرە راپەرینەکەی ئەمجاری شێخ مەحمود تا دەهات زیاتر پەرەی دەسەند، تاڵەبانی یەکانیش لەگەلی رێك کەوتن. بەپێی قسەی یەکێك لە پارلەمانتارەکان لەو رۆژانەدا شێخ مەحمود ببووە "مەسەلەیەن هیچ مەسەلەیەك لەو گەورەتر ئەبوو". لەبەر ئەوە پێویست بوو لە هەموو لایەکەوە فشاری بخەنە سەرو هیچ دەرفەتێك بۆ خۆیو لایەنگرانی نەهێڵنەوە. لەو قۆناغەی بزوتنەوەکانیدا، وەك زۆر قۆناغی تری رابوردووی ئەو بزوتنەوانە، کوردستانی ئێرانو بەتایبەتی دزلیو بانەیی بوویوە یەکێ لە هۆ سەرەکی یەکانی هێزو توانای شێخ مەحمود. کەوابێ دامرکاندنەوەی راپەرینی نوێی کورد پێویستی ی بەهاریکاری ی ئێرانی رەزاشاش هەبوو. مەلیك فەیسەل بۆ خۆی داوای لەتاران کرد کۆبوونەوەیەکی هاوبەش لە نێوان هەردوو لادا ساز بکرێ بۆ رێکخستنی هاریکاری ی سەربازی دژی شێخ مەحمودو مەحمود خانی دزلی، هەمان کات داواشی لە ئینگلیزەکان کرد پشتیوانی لەو کۆششەی بکەن.

ئینگلیزەکان لەم بووارەشدا درێغی یان نەکرد. بە وێنە هەر ئەوەندە زانی یان شێخ مەحمود ئیازی یە جێژنی قوربان لە پیران بەرێتە سەر یەکسەر بە "بروسکەیەکی گرنگ" رۆژی 24 نیسانی 1931 تارانیان ئاگادار کرد. کاتێکیش تاران رازی بوو بەو کۆبوونەوەیەی مەلیك فەیسەل داوای کردبوو بکرێ بەپێی راوێژی ئینگلیزەکان وەفدی هاوبەشی عێراقو ئینگلیز بە فرۆکەی تایبەتی ی مەلیك خۆی چووە ئێران.

ئێرانی یەکان بەگەرمی پێشوازی لە پێشنیارەکەی مەلیك فەیسەل



لایەك لەکتێبخانەکەی کەمال مەزهەر لە مالەکەی لەبەغدا

کرد. بەڵگەنامەکانی ئینگلیز پوختەی ئەم کارەیان بەم جۆرە بۆ تۆمار کردووین:

"ئێرانی یەکان دەستوبردو بەسەر راستی بەدەنگ ئەم داوایەوە هاتن، بەوە قایل بوون پێکرا هاریکاری دژی یاخی گەرانی (کورد) بکەن. پێشنیار کرا کۆبوونەوەکە لە ماریوان بکری چونکە لەوێ دەتوانرێ شوێنی لەبار بۆ نیشتنەوەی فرۆکە ئامادە بکری. مەریوان 42 میل لەولای رۆژهەلاتی سلێمانی یەوەیەو 10 میلیش لە سنوورەوە دوورە".

بەو جۆرە ئێران بووە فاکتەرێکی کاریگەری نوێ دژی راپەرینەکەی شێخ مەحمود. هەمان کات پەرلەمان بەگەرمی خەریکی لێکۆلینەوە بوو بۆ تەرخان کردنی خەرجی نوێ بۆ کاورباری سەربازی دژی شێخ مەحمود. لەگەڵ دەست پێ‌کردنی وەرزی بەهاردا فرۆکە جەنگی یەکانی ئینگلیزیش توانای دەست وەشاندنیان لە جاران زۆر زیاتر بوو.

شێخ مەحمود ئاگای لەبەشی زۆری ئەم کەمێزو بەینانە نەبوو. دلنیابوون لە پشتگیری جافو هەمەوەندو تاڵەبانی و رەنگەنەو جەباری پانی پێوە نا روو بکاتە ناوجەرگەی گەرمیان بەو نیازەی لەوێ گورزی توندتر لە دوژمن بوەشێنێ. ئەم بریارە لە دەستیا شکایەوە. فرۆکەکانی ئینگلیز هەنگاو بە هەنگاو تاقیبیان دەکرد، بەپێی زانیاری یەکانی ئەوان لەشکری میری خۆی بۆ شەری گەورەی داهاتوو ئامادە ئەکرد.

ئەو شەرە رۆژی پێنجی نیسانی سالی 1931 لە ئاوباریک قەوما کە هەمووی بەسەریەکەوە 20 میل لە دوزخورماتورەوە دوورە. باس و خواس و بەسەرهات و ئەنجامەکانی ئەو شەرە وتاریکی گەورەی سەربەخۆیان پێ دەوێ. ئەوی من مەبەستمە رۆلی فرۆکە جەنگی یەکانی ئینگلیزە لە ئاوباریک.

هەر لە سەرەتاوە دەلێم بۆمباکانی ئەو فرۆکانە سەرئەنجامی ئاوباریکیان دیارکرد. بەلایەنی کەمەوە هەزارو یەك بەلگەی جۆراو جۆر لەناو فایلە تایبەتیەکاندا دەربارەی ئەو راستی یە بەرچاو دەکەوێ. لێرەشدا چەند نموونەیەکی هەلبژاردەی کەم دێنمەوە.

رۆژی چواری نیسان فرۆکەکانی هێزی ئاسمانی بەریتانیا لە عێراق بەوەیان زانی کە شێخ مەحمود گەیشتۆتە گوندی ئاوباریك، هەر ئەوان یەکسەر بنکەی گۆیتەپەیان لەوە ئاگادار کرد تا هێزەکانی میری بێ دواکەوتن روو بکەنە ئاوباریك لەوساشەوە ئەو فرۆکانە ئاسمانی ناوچەکەیان بەرنەدا ئەبا بەر لە گەیشتنی هێزەکانی میری شێخ مەحمودو هێزەکانی بتوانن بکشێنەوە. ئینگلیزەکان بۆ خۆیان لەم بارەیەوە دەلێن:

"لە ئاوباریك بە بۆمبابارانو دەستریژی بێ‌وچانی هێزی ئاسمانی مەلەکی دوژمن لە شوێنی خۆیدا راگیرا" تا سەعات چواری لای ئێوارە هێزەکانی میری گەیشتنە جێ. ئەو هێزانە "هێرشێکی ئازایانەیان بردو زیانی گەورەیان لێ کەوت، بەلام لەگەل ئەوەشدا نەیانتوانی هەموو گوندی ئاوباریك بگرن". "هەردووك هێزەکەی میری لەبەرامبەر دوژمنێکی چەکداردا کە خۆی لەسەنگەری چاکدا مەلاس دابوو، ئازایانە دەجەنگی، تەواو لاواز بوون. بۆیەکا دوژمن کە شەو داهات توانی خۆی قوتار بکات". لەگەل ئەوەش، وەك راپۆرتی ئینگلیزەکان دەلێن، شەری ئەو رۆژە "وزەی یاخی بووانی (کوردی) تەواو هەلئەکاند، چونکە هێزی ئاسمانی مەلەکی بەتوندی و بێ پەرژەیی بۆمبابارانی ئەکردن".

فەرماندەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عێراق لە راپۆرتە دوورو درێژەکەی خۆیدا دەربارەی بزوتنەوەکانی شێخ مەحمود لە پاییزی سالی 1930وە چەند لاپەرەیەکی بۆ شەری ئاوباریك تەرخان کردووە کە تێیاندا بەوردی وێنەیەکی پانۆرامائاسایی گەلێك لایەنی ئەو شەرەی بە ژمارەو ناوەوە بۆ کێشاوین. بەشی زۆری ئەو لاپەرانە باسی چالاکی ی فرۆکەکانی ئینگلیز دەکەن ئەمە پوختەیانە:

فەرمان درایە دەستەیەك (رف) لە فرۆکەکانی پۆلی 30ی بۆمباهاوێژ لە کنگرەبان بەرابەری فرۆکەوان ا. ب. لیچمەر بەدرێژایی رۆژ بەهۆی بێ‌تەل ئزیکەوە پێوەندی بە هێزە پیادەکانی میری یەوە بکات. هەمان کات فەرمانیش درایە دەستەیەك لەفرۆکەکانی پۆلی 55ی بۆمباهاوێژ لە سلێمانی کە ئەوانیش بەدرێژایی رۆژ تاقیبی جموجۆلی شێخ مەحمود بکەن، بۆ جێ‌بەجێ کردنی ئەو مەبەستە "پێویست بوو ئەو فرۆکانە بێ‌وچان (یەنۆرە) بە ئاسمانەوە بەسەر یاخی یەکانەوە بن لەو ساتەوەی دەیاندۆزنەوە" فەرمانیش درایە "دەستەی ژمارە دووی فرۆکەکانی پۆلی 55ی بۆمباهاوێژ کەوەك هێزێکی دەسوەشێن ئامادە بن و هەر کە هەوالیان لە رێگەی بێ تەلەوە پێ گەیشت ئەوانیش دەستبەکاربن" رۆژی پێنجی نیسان "فرۆکەوان گ. گاردنەر کە لەگەل هێزە دەسوەشێنەکەی خۆیدا لە سلێمانی یەوە فری بوو لەورووبەری 60 تا 100 لە یاخی یەکانو ژمارەیەك ولاخی قەلتاغ کراوی لەناو دارو درەختو جۆگەلەکانی باشووری ئاوباریکدا بەدی کرد، دەستوبرد هێرشی بردە سەریان، کە بۆمباو گوللەکانی فرۆکەکانی تەواو بوون فەرمانی دا یەکێك لە فرۆکەکان بگەرێتەوە سلێمانی بۆ راگەیاندنی هەوالەکە. خۆیشی (لەگەل هاوەلەکانی) هەر بە ئاسمانەوە مایەوە تا یاخی یەکان نەتوانن لە شوێنی خۆیان بجوڵێن. هێزەکانی میری کە نزیك کەوتبوونەوە بەوردی لە شوێنی یاخی یەکان ئاگادار کران. گشت فرۆکە بۆمباهاوێژەکانی هەردووك پۆلی 55و 30 بەدرێژایی دوا سەعاتەکانی ئەو رۆژە خەریکو بۆمبابباران بوون، هەر کە بەنزین یاتفاقیان تەواو دەبوو بە پەلەو بێ دواخستن پر چەکو سووتەمەنی دەکرانەوە، هەمیشە بەلای کەمەوە فرۆکەیەك بەسەر تەوقەسەری یاخی یەکانەوە دەمایەوە. بەو جۆرە یاخی یەکان خۆیان لە باروودۆخێکی ترسناکدا دی‌یەوە. کە فرۆکەکان هێرشیان دەکردە سەریان ئەوانیش لە خوارەوە بەخەستی دەستڕێژیان لێ دەکردن. گوللەیەك تانك بەنزینی فرۆکەکەی گاردنەری کونکرد، بەلام گاردنەر توانی لەدووری چەند میلێك لەولای باشووری رۆژئاوای دوزخورماتووەوە بێ زیان بنیشێتەوە".

راپۆرتەکە لەسەری دەرواو دەلێ: "ژمارەیەك لە یاخی یەکان خۆیان لەبەشی خواروی گوندەکەدا قایم کردبوو، بەشێکی تریان پەنایان بردە بەر ئەو دۆلە قوولەی کەوتۆتە لای رۆژهەلاتی گوندەکەوە. بەلام ج ئاوباریك‌و ج ئەو دۆلە بێ‌وچان بەپێی توانا لە ئاسمانەوە بە خەستی دەستڕێژیان لێ دەکرا، بەرادەیەك بە درێژایی ئەو رۆژە هیچ دەرفەتێکی هەلهاتن بۆ یاخی یەکان نەمابووە. بەنیازی کەلك وەرگرتنی تەواو لەم هەلە رەخساوەو بۆ دەس وەشاندنێکی توندوتۆل لە یاخی یەکان دەورووبەری سەعات 13 فەرمانێدا دەستەیەك لە فرۆکەکانی پۆلی ژمارە 70 کە هەم بۆمباهاوێژو هەم راگوێزەرن، بە بۆمبا بار بکرێن، دەستوبرد بێ دواکەوتن روو بکەنە شەرگەی ئاوباریك تا ئەوانیش لە هێرشەکەدا بەشداربن. بەداخەوە بە هۆی هەلەیەکی ناچاوەروانەوە فرۆکەکانی پۆلی ژمارە 70 تا درەنگانێ نەگەیشتنە ئاوباریك، ئەوساش ئیتر نەدەتوانرا نیشانەکان بەوردی دەستنیشان بکرێن و لەترسی پێوەبوونی هێزەکانی میری فەرمان درایە ئەو فرۆکانە لە کنگرەبان بنیشنەوە تا سبەی رۆژ هەلدێ، بەلام ئەوان بەو شەوەش موراقەبەی کشانەوەی یاخی یەکانیان ئەکرد، هەرچەندە لەم هەولەیاندا سەرکەوتوو نەبوون بۆ رۆژی دوایی ئەوانیش کەوتنە راونانیان".

بەپێی راگەیاندنی بەیاننامەی میری ژمارەی ئەو کوردانەی لەشەری ئاوباریکدا کوژراون 37 کەس بوو، هەلبەت ژمارەی بریندارەکانیان لەوەیش زیاتر بوو، دوور نی‌یە ژمارەی کوژراوەکانیش لەوە تێپەریێ کە میری رای گەیاند. هەرچۆن بێ یەکێك لە بەلگەنامەکانی ئینگلیز راستەوخۆ دانی بەوەدا ناوە کە تەقریبەن سەرجەمی کوژراوەکانی کورد لە ئاوباریك "بە گوللەی رەشاشی فرۆکە لە ئاسمانەوە پێکراون" بەرامبەر بەوە لەسایەی فرۆکەکانی ئینگلیزدا زیانی هێزە چەکدارەکانی میری یەکجار کەم بوو- 6کوژراو و 18بریندار، لەکاتێکدا بەپێی یاسای جەنگ دەبوو زیانی ئەوان زۆر لە زیانی شۆرشگێران زیاتر بوایە، چونکە ئەوان هێرشیان دەهێنار ئەمان لە سەنگەری چاکدا بەگری‌یان دەکرد.

دوای ئاوباریك فرۆکە جەنگی یەکانی ئینگلیز دەستیان لە شۆرشگێرانی کورد هەلنەگرت تا بە تەواوی وزەیان پێ بەردان لەم بارەیەوە دانەری راپۆرتێکی تری ئینگلیزەکان دەربارەی دوا قۆناغی بزوتنەوەکانی شێخ مەحمود نووسیویە دەلێ:

"هەمان کات فرۆکەکانی هێزی ئاسمانی مەلەکی هەنگاو بە هەنگاو کەوتنە بۆمبارانی یاخی یەکان، هێزە پیادەکانیش بۆ یارمەتی بەو خێرایی یەی سروشتی ناوچەکە بوواری ئەدان پێش ئەکەوتن. لە ئەنجامدا شێخ مەحمود هەناوی کەوتو وزەی لێ برا، زۆربەی لایەنگرانی لێی تەکینەوە، بۆ خۆیشی رۆژی بیستو یەکی (نیسان) پەنای بردە بەر ئێران، شەوی بیستو سێش چووە پیران کە هەشت میل لەولای باشووری رۆژهەلاتی پێنجوێنەوەیە. فەرمان درایە هێزە پیادەکان لە پێنجوێن کۆببنەوە".

ئەمجاریان ئێرانیش ئامادە نەبوو دالدەی شێخ مەحمود بدات.



ڕۆژی پێنجی مایسی 1931 سەرکردەی هێزە پیادە شەڕکەرەکانی میری لە کوردستان زەعیم خەلیل زەکی بەیاوەری ئەفسەری بەریتانی ڕۆبرتس کە ڕاوێژکاری بوو بە فڕۆکەی تایبەتی خودی مەلیک فەیسەڵ چوونە مەریوان و لەوێ لەگەڵ سەرهەنگ (عەقید) مەحمود خانی ئەمین کۆبوونەوە. بەڵگەنامە تایبەتی‌یەکان بەم جۆرە باسی کۆبوونەوەکەی مەریوان ئەکەن:

"کۆبوونەوەکە تەواو سەرکەوتوو بوو. هەردوولا ڕێک کەوتن پێکڕا دەستبەکاربن. بۆدابین کردنی پێوەندی خێرا بڕیار درا بێ تەل بەکار بهێنرێ. سەرەتا ڕۆژی دوازدەی مایس بۆ دەست بەکار بوونی ئیرانی‌یەکان دانرا، دوایی کرایە شازدەی مایس".

بەو جۆرە هیچ دەرفەتێک لەبەردەم شێخ مەحموددا نەمایەوە. ڕۆژنامەی "تایمس"ی لەندەنی لەم بارەیەوە نووسیوویە دەڵێ:

"هێزە سەربازی‌یەکانی ئێران لەنزیک گوندی پیرانی سەرسنوور کە شێخ مەحمود پەنای بردبووە بەر، خۆیان ئامادە کردو ڕایان گەیاند کە سوورن لەسەر ئەوەی ڕۆژی چواردەی مایس شێخ لەخاکی ئێران وەدەرنێن. هەمان کات لەمدیو سنووردوە هێزە چەکدارەکانی عێراقیش خۆیان بۆ هێرشێکی هاوکات ئامادە کرد تا پەلاماری شێخ بدەن ئەگەر هاتو سنووری پەڕاند. ڕۆژی سیازدەی مایس هەردوولا خۆیان بۆ هێرشی هاوبەشی ڕۆژی داهاتوو ئامادە ئەکرد".

ئینگلیزەکان شێخ مەحمودیان لەوە ئاگادار کرد کە ئەگەر دەست هەڵنەگرێ ئەوا "هێرشی هاوکاتی" هەردوولا بۆ سەر هێزەکانی بێ دواخستن دەست پێ ئەکا.

بەو جۆرە شێخ مەحمود ناچار بوو دەست لە خەبات هەڵگرێ، ڕۆژی سیازدەی مایس دوابڕیاری خۆی ڕاگەیاند. هەر ئەو شەوەش هاتەوە ناو خاکی عێراق. بەپێی قسەی پەیامنێری "تایمس" شێخی ماندوو لە ژوورێکی قوڕدا لە دەرەوەی پێنجوێن تا بەرەبەیان خۆی داوەتە دەست خەوێکی قووڵ، کە ڕۆژ هەڵدێ، واتە چواردەی مایس، شێخ ڕوودەکاتە ناو شارو دوای گفتوگۆیەکی دوورو درێژ لەگەڵ کاپتن ڤیڤان هۆڵت، کە سێر فرانسیس هەمفریزی نوێنەری باڵا بەناوی خۆیەوە ناردبووی، بە بەشداری موتەسەریفی سلێمانی ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ، شێخ خۆیدا بەدەستەوە.

هەر ئەو ڕۆژەی شێخ مەحمود بڕیاریدا چەک دانێ، واتە سیازدەی مایسی 1931، یەکسەر فرانسیس هەمفریز لە بەغداوە بروسکەیەکی دایە وەزیری موستەعمەرات لە لەندەن. چەند لایەنێکی ئەو بروسکەیە سەرنج ڕاکێشن، یەکەمیان خێرایی ناردنی‌یە، سەعات نۆو بیست دەقیقەی بەیانی‌ی چواردەی مایس ئەو بروسکەیە گەیشتە لەندەن، واتە لەکاتێکدا هێشتا گفتوگۆکەی نێوان شێخ مەحمودو کاپتن هۆڵت لە پێنجوێن تەواو نەبوبو، لەلای سەرەوەی بروسکەکەش نووسراوە گرنگ وەک نیشانەی بایەخی ناوەڕۆکی، ئەو بروسکانەی وانەبوونایە لەسەریان دەنووسرا "ئاسایی". دێڕێکی ناو دەقی بروسکەکەش بۆ ئەم باسەی ئێمە بایەخی تایبەتی‌ی خۆی هەیە، هەمفریز لەو دێڕەی بروسکەکەیدا دەڵێ: "هۆی سەرەکی ئەم ئەنجامە یەکجار چاکە دەگەڕێتەوە بۆ چالاکی‌یەکانی هێزی ئاسمانی مەلەکی" بەریتانی.

"هەواڵەکە چ بۆ ئینگلیزو چ بۆکاربەدەستانی میری گەورە بوو، تا ڕادەیەکیش هەواڵێکی زۆر چاوەڕوانکراو نەبوو. بەڵگەنامەیەکی وەزارەتی موستەعمەرات بێ کەمو زیاد بەم دێڕە دەستی پێ کردووە: "خۆبەدەستەوەدانی شێخ مەحمود هەواڵێکی یەکجار خۆشە". هەر ئەو ڕۆژەش، واتە ڕۆژی چواردەی مایس، مەلیک فەیسەڵی یەکەم نامەیەکی پیرۆزبایی تایبەتی‌ی نارد بۆ سێر فرانسیس هەمفریز. مەلیک فەیسەڵ لە نامەکەیدا دەڵێ: "دەمەوێ بەم بۆنەیەوە هەستی پڕ لە بەختەوەری خۆم. دەربڕم و سوپاسی بێ‌پایانم بە نێوەی پایەبڵند بگەیێنم بەرامبەر بەو کۆششەی داتان لە بڕیاری ئەو یاریدەیەدا کە هێزەکانی خاوەن شکۆی بەریتانی دایانو بووە هۆی گەیشتن بە ئەنجامێکی وا چاک".

مەلیک فەیسەڵ لەو نامەیەیدا دەیەوێ وای نیشان بدات ئەوەی کراوە هەمووی لەبەر خاتری چاوی کاڵی باکوورو باکووری‌یەکان بووە تا بەو جۆرە لەدەست زوڵم و زۆری شێخ مەحمود ڕزگاریان بکەن. ئەو ڕۆژانە کاربەدەستان و ئەندامانی پەرلەمان و ڕۆژنامەنووسانی سەر بەمیری و ئاحەزی میری وەک یەک، جاروبارێش ئینگلیزەکان وایان ڕادەگەیاند گوایە کورد زەلالەتی بوو بەدەست شێخ مەحمودەوە، خوا خوایان بوو ڕۆژێ زووتر لەدەستی ڕزگاریان بێ. وەڵامی ئەم شێواندنە لە زاری دوو شایەتی ئاحەزی بیانی‌یەوە دێنمەوە

شایەتی یەکەم کاپتن ڤیڤیان هۆڵتە کە کاربەدەستێکی بەتواناو ئاگادار بووە، کوردی‌یەکی چاکی زانیوەو وەک وتمان ئەو بەناوی نوێنەری باڵاوە لە پێنجوێن گفتوگۆی لەگەڵ شێخ مەحمودا کردو بۆ ڕۆژی دوایی لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە سلێمانی و لەوێوە بردی‌یە بەغدا. ڤیڤیان هۆڵت دوای دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەی شێخ مەحمود ڕاپۆرتێکی نهێنی‌ی دەربارەی ئەو ڕاپەڕینەو گفتوگۆی خۆی لەگەڵ شێخداو بە گواستنەوەی بۆ سلێمانی و لەوێوە بۆ باشووری وڵات داناوە. لەو ڕاپۆرتە بایەخدارەیدا هۆڵت نووسیوویە دەڵێ:

"شێخ مەحمود ئازایانە، خاوێن و مەردانە دەجەنگی، دۆڕاندنی لەشەڕدا ناوی لەناو کوردی باشووردا ئەنەزراند. دوای ئەوەی لە پێنجوێن خۆی دایە دەستەوەو بەدەسبەسەری گواستمانەوە، کوردی گوندەکانی دامێنی چیاکان بە لێشاو بەسەریا دەڕژان، بە پەرۆشەوە دەستیان ماچ ئەکرد، گەلێکیان بەچاوی پڕ فرمێسکەو هەنسکەوە ماڵ ئاواییان لێ ئەکرد. باسی دڵ ڕەقی‌ی ئەکەن، بەڵام کێ شایەتە؟، لەناو لادێی‌یەکاندا شایەتێکی وا نی‌یە، ئەوان لەکاتی بەزینیدا پالەپەستۆیان بوو تا فریاکەون دەستی ماچ کەن. شایەتێکی وا لەناو فڕۆکەوانەکانی هێزی ئاسمانی مەلەکیشدا، کە دژی جەنگین، چنگ ناکەوێ، دوانیان لای شێخ دیل بوون، ئەوانیش هەموویان بەدڵ دەیانویست لەوکاتی شکستی‌یەیدا دڵنەوایی بکەن. کەس لاری‌ی لەوە نی‌یە شێخ گەموجو خاوەن کیبریا بوو، بەڵام هەردووکیان بۆ نەتەوەکەی بوون نەک تەنها بۆخۆی، زۆر کەسی تریش وەک ئەو گەموجو خاوەن کیبریا بوون و ئەوەیان پێ شەرم نەبوو. یا ئازناوی چەتەو یاخی‌گەری لە ئاستی یاسادا پێ ببەخشین، ئەی غاریبالدی و مستەفا کەمالیش وەک ئەو نەبوون. خۆ ئەگەر بێتو هەردووک لایەنی مەسەلەکە وەبەرچاوگرین ئەوساکە دروستترین حوکم بەسەریا ئەوەیە کە گەورەترین هەڵەی شێخ بریتی بوو بەوەی سەدەیەک درەنگ تر لەوەی دەبوو لەدایک بوو. ماڵت ئاوا کاپتنەکان ڤیڤیان هۆڵتی دوژمن بۆ خۆت و ویژدانی ڕاست گۆییت، هەڵبەت شێخ مەحمود بەو هەموو هەستی کوردایەتی و ئازایەتی و دڵسۆزی و جوامێری‌یەی خۆیەوە

سەرەتای سەدەی نۆزدەمین، کاتێك فڕۆکەو چەکی کوشندەو عەقڵی وردی ئینگلیز لە ئارادا نەبوو، شتێکی بۆ کورد پێ نەکرا.

شایەتی دووەممان پەیامنێری ڕۆژنامەی هەرە بەناوبانگی "تایمس"ە. دەربارەی هەمان باس لەمیان ڕۆژی 20 مایسی ساڵی 1931 لە بەغداوە ڕاپۆرتە هەواڵێکی بۆ ڕۆژنامەکەی ناردووە، تێیدا دەڵێ:

نمونەیەکی هەڵبژاردە ئەخەمە بەرچاو

بەیەکەم ناوی یەکەم لیستە دەست پێ ئەکەم: جەنەراڵی فڕۆکەوان کریستۆفەر لۆید کۆرتنی، بەر لەوەی بێتە کوردستان دوو میداڵی بەرزی وەرگرتووە، فەرماندەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عێراق لە پێشنیارەکەیدا بۆ ئەوەی میداڵێکی نوێی بدەنێ ئەڵێ:

"لەسەر خزمەتی چاکی بەگشتی، بەتایبەتیش لەبەر ئەو چالاکییانەی لەکاتی یاخیبوونی هۆریزو شێخاندا لە ڕۆژانی 27تا 31ی مارتی 1931دا نواندنی. لەو ڕۆژانەدا بارودۆخی ئەو ناوچەیە گەیشتە ئاستێکی زۆر ناسەقامگیر و ترسناك. سەدان یاخیبوو نزیکەی 80 پۆلیسی ناو پۆلیسخانەی بێلولەیان بە توندی بۆ ماوەی نزیکەی حەفتەیەك گەمارۆدا، بێلولە مەڵبەندی ناحیەکەیە. یاخییەکان بەرەو باکوور بۆ لای خانەقین پەرەیان بەدەسەڵاتی خۆیاندا، وەزعەکە ئاشکراو خێرا بەرەو خراپی دەشکایەوە. حکومەتی عێراق چەند جارێك داوای لێ کردین فڕۆکە بنێرینە سەر ناوچەی یاخییەکان. ڕۆژی 27ی مارت جەنەراڵی فڕۆکەوان کۆرتنیم ناردە خانەقین بۆ ئەوەی ڕابەریی هێرشی فڕۆکەکان بکات. بۆ خۆی بە فڕینێکی نزمی ئازایانە توانی زۆر بەوردی لەباری ناوچەکە تێبگات. زانی کەوڕەو میزاجی یاخییەکان یەکجار بەرزەو بەرامبەر بەوان وورەی پۆلیسەکان تەواو نزمە. "کاتێك شێخ مەحمود بەدیل بەرەو سلێمانی نجیانبرد لە هەموو شوێنێك بە ئەوپەڕی دڵنەوایی لێ کردنەوە پێشوازیی لێ دەکرا. دانیشتوانی شاری سلێمانیش بۆ پێشوازیی دەست ماچ کردنی هاتنە دەرێ".

کاك فوئاد دەڵێ دانیشتوانی کەرکوکیش بەهەمان دەستوور پێشوازیی شێخ مەحمودیان کرد.

بەم جۆرە بە ڕەبری بۆمبابارانو ڕاودونانی فڕۆکە جەنگییەکانی ئینگلیز لە ماوەی نزیکەی حەوت مانگدا پەردە بەسەر دواقۆناغی بزوتنەوەکانی شێخ مەحمودا بەیەکجاری دادرایەوە. ئینگلیز هیچ کاتێك وا گەرم دژی کورد نەهاتنە دەست. ئەمجارەیان زۆرترینو بەتواناترین فڕۆکەوانیان خستەکار. دوای بەدیلگرتنی شێخ مەحمود چەند لیستەیەکی تایبەتییان بەناوی ئەو فڕۆکەوانانەوە دەرکرد کە بڕیار درا بەو بۆنەیەوە نیشانو میداڵی سەرکەوتنیان پێ بدرێ. لەو لیستانەدا پوختەی ژیانی هەر یەکێکیان تۆمار کراوە، جا وا لێرەدا بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست چەند سەرنجەکانی کۆرتنی وەك ئەو زانیارییانە بوون کە بەر لەوە پێمان گەیشتبوون دەربارەی ئیازی پۆلیسەکان کە خۆیان بدەن بەدەستەوە. دوای ئەوەی کۆرتنی بە شێوازێکی زۆر چاکو ڕابەریی هێرشی فڕۆکەکانی کرد، بەجۆرێك لەماوەی تەنها سێ ڕۆژدا توانرا بارودۆخەکە ئاسایی بکرێتەوە، یاخییەکان بەناچاری بڵاوەیان لێ کرد، پەنایان بردە بەر گردو تەپۆلکەکانی ناوچەکە، دەستوبرد دەسەڵاتی کارگێڕی گەڕایەوە گشت ناحیەیەکە. بە زیانێکی گیانی زۆر کەم ئەم ئەرکە ڕاپەڕێنرا. تارادەیەکی زۆر هۆی ئەم سەرکەوتنە لەو ڕابەرییە وردو بەرزەدا بەدی ئەکرێ کە جەنەراڵی فڕۆکەوان کۆرتنی لەکاتی هێرشی ئاسمانیدا نواندی. لەبەر ئەوە پێشنیار ئەکەم میداڵی جۆری باشی پێ ببەخشرێ. ئیمزا لیوای فڕۆکەوان، فەرماندەی هێزی ئاسمانی (بەریتانی) لە عێراق".

دووەم ناوی هەمان لیستە موقەددەمی فڕۆکەوان ئەلفرێدگەی ڕۆناڵد گاروده. ئەمیشیان بەر لەوەی بێتە کوردستان دوو میداڵی بەرزی وەرگرتووە بەپێی گێڕانەوەی فەرماندەی گشتیی هێزی ئاسمانی لە عێراق پوختەی کارەکانی ئەم دژی شێخ مەحمود بەم جۆرەی لای خوارەوەبوو:

"بەسەرپەرشتیی گشتی خۆم موقەددەمی فڕۆکەوان گارود لە لیوای سلێمانی لە ڕۆژی 23ی مارتی 1931وە تا 25ی نیسانی ئەو ساڵە بەرپرسیاری هێرشی فڕۆکەکان بوو. بۆ خۆی ڕابەریی فڕۆکە بۆمباهاوێژەکانی پۆلی ژمارە 55ی دەکرد کە بنکەکەیان لە سلێمانی بوو. هەر ساتو ئانێك پێویست بوایە فڕۆکە بۆمباهاوێژەکانی پۆلی ژمارە 30و پۆلی ژمارە 84و فڕۆکە بۆمباهاوێژو ڕاگوێزەرەکانی پۆلی ژمارە 70 بۆ یارمەتی دەهاتنە سلێمانی.

سەرباری ڕابەری کردنی هێرشی فڕۆکە گارود هەمان کات یاریدەی مێجەر ڕۆبرتسی دەدا کەبەرزترین پلەداری پیعسەی بەریتانی بوو لە سلێمانیو ڕاوێژکاری یەکەمی فەرماندەی لەشکری عێراقی بوو.

ئەرکەکانی سەرشانی گارودگەلێك دژوارو زەحمەت بوون، ئەو هەرچەندە تا نیوەشەو بەکاروباری هێزە پیادەکانەوە خەریك دەبوو کەچی بەرەبەیان خۆی دەگەیاندە فڕۆکەخانەی شار تا لەسەرەتای دەست بەکاربوونی فڕۆکەکانی دڵنیابێ، چەند جارێکیش دەرفەتی بۆ خۆی ڕەخسان بە فڕۆکە بچێتە سەر ناوچەکە تا بە وردی دەرسی سروشتی نیشانەوباری گشتیی ئەو شوێنانە بکا کە دەبوو فڕۆکەکانی پۆلەکەی بچنە سەریان. لە هەموو ڕوویەکەوە نمونەیەکی بێ هاوتا بوو، لەمەیانەی پێوەندییەکانیشدا لەگەڵ هێزەکانی میریدا شارەزاییەکی چاکی نواند. لەبەر ئەوانە پێشنیار ئەکەم نیشانی ئیمپراتۆریی بەریتانی پێ ببەخشرێ..".

نمونەی سێیەممان پاڵەوانێکی بەجەرگی کەم وێنەیە، ئەمیان ڕائیدی فڕۆکەوانە، ناوی جۆرج سیسیل گاردنەرە، سەر بە پۆلی پەنجاو پێنجی بۆمباهاوێژ بوو. ئەمە پوختەی سەرگوزشتەی چالاکییەکانی گاردنەرە لەدواقۆناغی ڕاپەڕینەکەی شێخ مەحمودا:

"گاردنەر یەکەم کەس بوو کە ڕۆژی 30ی مارت یاخیگەرانی لە گوندی بانی مۆرت دۆزییەوە یەکسەر بەبێتەل داوای لە سلێمانی کرد فڕۆکە بنێرن، ئەو هێزەی میریشی ئاگادار کرد کە لەو نزیکانە بوو. ئینجا خەستو خۆڵ کەوتە بۆمبابارانو دەسترێژی ڕەشاش لێیان. پاش ماوەیەك، هەمان ڕۆژ یاخییەکانی لە سێ گوندی تریی نزیك بانی مۆرتەوە دۆزییەوە. بۆ خۆی ڕابەریی هێرشی فڕۆکەی بۆ سەر ئەوانیش کرد.

سەرەتای نیسان دیسان دەستەیەك یاخیگەری لە گوندی دەروزاملك (؟) بەدی کرد، ڕابەریی هێرشی سەر ئەوانیشی کرد.

ڕۆژی پێنجی نیسان گاردنەر یەکەم فڕۆکەوان بوو بەدروستی شوێنی شێخ مەحمودی لەناوباریك دەستنیشان کرد، یەکسەر پەلاماری دوژمنیدا، ئەوانیش لە خوارەوە بەخەستی دەسرێژیان لێ دەکرد، وەستایانە ڕەشاشەکانی ناو فڕۆکەکەی خۆی بەکار ئەهێنا، تایبەت لەو کاتەی گشت فڕۆکەکانی تر گەڕانەوە بنکەکانی خۆیان بۆ بارکردنی بۆمبا، بەو جۆرە یاخییەکانی ناچار کرد لەناو گوندی ئاوباریك و دەوروبەریدا گیر بخۆن تا هێزی پیادەی میری گەشتە جێ. گەلێك گوللە تفەنگی دوژمن بەر فڕۆکەکەی کەوتن، تانکیی بەنزینو کابرێتەرەکەیان کونادەر کرد، فڕۆکەکەی بەلایەنی کەمەوە 47 جار پێکرا، هەرچەندە کلپەی ئاگری بەنزین زۆری بۆ هێنا ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا توانی بە سەلامەتی لە نزیك وێستگەی شەمەندەفەری سلێمان بەگەوە بنیشێتەوە، هەمووی دوو سەعاتی نەخایاند دوای ئەو نیشتنەوە ناچارییەی کاتێك فڕۆکەیەکی تری لە بنکەی هنیدیەوە (موعەسکەر ڕەشیدی ئێستا لە بەغدا - ك. م) بۆ هاتو بێ دراکەوتن هاتەوە سەر ئاوباریك. دیسان کەوتەوە بەر ئیشاوی ئەقەی دوژمن، ئەمجاریش، بێ گومان، دەسرێژی نیشان پێکی ڕەشاشەکانی ئەو هێزە پیادەکەی میریی لە زیانی گەورە ڕزگار کرد.

ڕۆژی 17ی نیسان گاردنەر ڕابەریی هێرشی فڕۆکەکانی بۆ سەرکان کرد. دوژمن فڕۆکەکەی کوناودەر کرد. دوای چوار ڕۆژ، واتە 21ی نیسان لە سپاگوێز تاقمێکی گەورەی تری لە یاخییەکان بەدی کرد، ئەو تاقمەش بەرابەری خۆی کەوتنە بەر شاڵاوی هێرشی ئاسمانی.

خوێن گەرمیو چاوبەترسیی ئەم ئەفسەرە بە درێژایی ڕۆژانی هێرشەکان بە بەرچاوی هەموانەوە ڕوونو ئاشکرا بوون، بەدووگەڕانو هێرشە توندوتیژەکانی لەناو ئاگری دەسرێژی دوژمندا ڕۆڵی باڵایان لەخۆ بەدەستەوەدانی شێخ مەحمودا بینی. پێشنیار ئەکەم میداڵی خزمەتی باڵای بدرێتێ".

لەناو لیستەکاندا گەلێك نمونەی تری لەم بابەتە وەبەر چاو ئەکەون. ئەفسەری فڕۆکەوان سیدنی جوزێف کار 185 سەعات فڕینی تەنها لەکاتی هێرشەکانی ئاوباریكو بانی مۆرتو گوندەکانی ئەو دەوروبەرەدا تۆمار کرد. بەپێی گێڕانەوەی فەرماندەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عێراق هێرشی ئازایانەی کار بۆ سەر سەنگەرەکانی لایەنگرانی شێخ مەحمود ڕۆڵی گەورەی هەبوو بۆ کپ کردنی دەسرێژیانو بەو جۆرە ڕێگەی بۆ سەرکەوتنی هێرشی هێزی پیادەی میری لە خوارەوە خۆش کرد.

فڕۆکەوانەکانی ئینگلیز زۆر جار ناچار ئەبوون بە نزمی بفڕن چونکە، وەك لە ڕاپۆرتێکدا

نووسراوە، شێخ مەحمود "کوێزو کەلەبەرو دارو پەردووی شاخ و داخی کوردستان شارەزا بوو، سالەهای سال بەشەڕی چەتەگەرییەوە خەریک بوو" بۆیەکا دەیزانی چۆن و لەکوێ لایەنگرانی هەلاس دەدا. ئەو شەرم فرینە بەردەوامە "بێ ئەندازە فڕۆکەکانی هیلاک کردبوو".

فڕۆکە جەنگییەکانی ئینگلیز بە هەزاران سەعات لە ئاسمانی کوردستاندا دژی شۆڕشگێرانی کورد گالەیان ئەکرد. بەوێنە تەنها سەردتای مانگی کانوونی یەکەمی سالی 1930 ئەو فڕۆکانە ماوەی 1496 سەعات تەنها بەسەر سورداش و دەوروبەرییەوە بوون کە وەک راپۆرتەکە ئەڵێ "یەکێکە لەناوچە هەرە سەختەکانی جیهان"[79]، ئەمە لە کاتێکدا کە هێشتا شەڕ تەواو گەرم نەبوبو، تۆفو بارانی زستانیش کۆسپێکی گەورە بوون لەبەردەم هەڵسانی ئاسایی ئەو فڕۆکانەدا.

وانەبوایە، وەک وتمان، راپەرینەکەی شێخ مەحمود بەهەموو لادا پەلی دەهاویشت. لێرەدا وەک بەڵگە باسی جافی گەرمیان دێنمەوە کە چۆن کۆششی ئینگلیزەکان رێگەی خەباتی لێ گرتن. لە راپۆرتە دوورو درێژەکەی خۆیدا فەرماندەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عێراق لەم بارەیەوە دەڵێ:

"دەبوو بە وریایی ئاگامان لە هەڵوەستی جافەکان بێ. لەبەر ئەوە ئەفسەرێکی تایبەتیی ئیستخباراتی هێزی ئاسمانی مەلەکیم نارده ناوچەی کفری. ئەفسەری ناوبراو سەرپۆل فڕۆکەوان ف. د. تۆمال بوو کە هەڵگری میدالێکە. دەزگایەکی بێتەلو شیوتالم زدێ پۆشم لەگەڵ نارد تا پێوەندی بە هۆزەکانەوە ببەستێ و بەردەوام لەبارودۆخی ناوچەکە ئاگادارم بکا. تۆمال قەڵای شیروانەی کردە بارگای خۆی. ئەو قەڵایە پۆلیسخانەیەو کەوتۆتە کەناری ناوچەی جافایەتییەوە. تۆمال لەو بنکەیەوە کارێکی فرەخاسی راپەڕاند، بەشێوازێکی رێک و پێک ئاشنای وەزعەکەی کردم. فڕۆکە بۆمباهاوێژەکانی پۆلی ژمارە 55ی بنکەی هێندیی خرایە بەردەست. تەختانییەکی لەباریان لەنزیک پۆلیسخانەکەوە دۆزییەوەو کردیانە فڕۆکەخانە. چەند جار فڕۆکەکان چوونە سەر ناوچە بزێوەکان، شوێنی رەشماڵ و جموجوڵیان خرانە ژێر چاودێرییەوە بەو جۆرە بەوردی (رەصدی) تیرەکانی جافمان کرد. وا دیارە فرینی یەک لەدوای یەکی فڕۆکەکان، لەگەڵ هەستی بێ دەسەڵاتیدا لەبەردەم هێرشی ئاسمانیدا کارێکی گەورەیان کردە سەر ئەو تیرانەو بوونە کۆسپ لەبەردەم بڵاوبوونەوەی ئاژاوەی لەناویاندا".

رۆژنامەی "تایمس"یش هەر لەو رۆژانەدا لە کورتە وتارێکیدا دەربارەی رۆڵی هێزی ئاسمانی بەریتانی دژی کورد دانی بەوەدا ناوە کە ژمارەیەکی زۆر لەسەرەک هۆزانی کوردستان چاوەڕوان بوون گەر شێخ مەحمود سەرکەوت بدەنە پالی، بەڵام: وەک رۆژنامەکە دەڵێ "خۆش بەختانە رێگەی ئەوەمان نەدرا".

فڕۆکەوانە ئینگلیزەکان دواییش بە شانازییەوە بیرەوەریی چالاکییەکانی خۆیانیان لە ئاسمانی کوردستاندا ئەکرد. یەکێکیان دوای تێپەڕبوونی چەند ساڵێک بەسەر ئاوبارێکدا تێرو تەسەل لەسەر لاپەرەکانی گۆڤارێکی خۆیاندا باسی ئەوەی گێڕاوەتەوە چۆن خۆی و هاوەڵەکانی ماوەی شەش حەفتەی رەبەق بەدووی شێخ مەحمودەوە بوون تا سەرئەنجام ناچاریان کردووە خۆی بەدەستەوە بدات.

رەنجی فڕۆکەوانانی ئینگلیز لە داپڵۆسینی نیشتمانپەروەرانی کورددا بەفیڕۆ نەڕۆی، ویڕای ئەو میدال و نیشانانەی بەسەر سنگیاندا هەڵواسران هی واشیان تێدابوو دوایی بوونە گەورە پیاوی ناسراوی وڵاتی خۆیان و جیهان. پۆلی ژمارە 30 کە چەند جارێک تا ئێستە ناویمان هێناوەو کەرکوک بنکەی بوو، سەرەتای بیستەکان ئەفسەری فڕۆکەوان جێمس رۆب فەرماندەی بوو، لە پەنجاکاندا رۆب ببووە مارشاڵی فڕۆکەوانی گەورەو بە فەرمانی پاشایی نازناوی پایەبەرزی سێری پێ بەخشرابوو. جۆنس ولیەمزیش بووە یەکێک لە فڕۆکەوانە هەرە بەناوبانگەکانی جیهان. ولیەمز لەو هێرشەدا بەشدار بوو کە مارشاڵی فڕۆکەوان جێفرنی کریسمەسی ساڵی 1923 کردییە سەر ماڵی شێخ مەحمود لە سلێمانی. پاش حەوت ساڵ جۆنس ولیەمز کاتێک لەپێش بڕکێیەکی جیهانیدا دەیویست بەرزترین پلەی خێرافرین بۆ خۆی تۆمار بکا، فڕۆکەکەی لەنزیک تونسەوە بەر یەکێک لە لوتکەکانی چیای ئەتڵەس کەوت و مرد.

بەکارهێنانی فڕۆکە دژی کورد بەو رادە فراوانە کەم نەکەوت لەسەر ئینگلیزیش. شۆڕشگێرانی کورد لە جاران زیاتر بەدەسڕێژ بەرەنگاری ئەو فڕۆکانە دەبوونەوەو جاروبار زیانی کوشندەیان پێ دەگەیاندن. لەم قۆناغەدا وێڕای ئەو فڕۆکەوانانەی کوژران دواییشیان بەدیلی کەوتنە دەست شۆڕشگێڕانی کورد. شێخ مەحمود بەدرێژایی چەند مانگێک جوامێرانە رەفتاری کردن، بۆ خۆیان دوای ئەوەی بەربوون لە هەموو شوێنێک باسی ئەوەیان ئەکرد چۆن شێخ مەحمود هەر کاتێک بیانویستایە دەیناردن بۆ راوەشکارو چۆن "هیچ کاتێک لە ژیانیاندا راوی وا خۆشیان نەکردووە". ئەو جۆرە رەفتارە دوایی وای لە ئینگلیز کرد، بەپێی قسەی خۆیان، لەوە دڵنیابن کە کورد پیاوانە لەگەڵ دیلەکانیان دەجووڵێنەوە.

لەڕووی ماڵیشەوە هێرشی بەرفراوانی هێزی ئاسمانی بەریتانی بۆ سەر کورد کەم نەکەوت لەسەر ئینگلیز. بەپێی سەرچاوەی خۆیان خەرجی تەنها دامرکاندنەوەی دواقۆناغی بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود یەک ملیۆن پاوەن بوو کە بۆ رۆژگاری خۆی پارەیەکی یەکجار زۆربوو، ئەوساکە بودجەی ساڵانەی هەموو عێراق بە زەحمەت خۆی دەدا لە پێنج ملیۆن پاوەن. دەبێ ئەوەیش لەیادنەکەین کە ئەوساکە لەندەن بۆ خۆی بۆ پوولێک دەچوون بە ئاسماندا، چونکە، وەک دەزانین، لە ساڵی 1929ەوە تاوەکو ساڵی 1933 گشت وڵاتە سەرمایەدارییەکان دووچاری گەورەترین کێشەی ئابووری هاتبوون کە تا ئەو سەردەمە مێژوو لەوێنەی بەخۆیەوە نەدیبوو. پێم وایە لەم بارەیەوە هێند بەسە گەر بزانین لەو رۆژانەدا بە سەدان کارگەی ئینگلتەرە لەکار کەوتبوون، ژمارەی بێکارە تەنها لەناو کرێکاراندا گەیشتە 3 ملیۆن کەس، لە 20%ی رۆژانەی ئەوانەشیان کەهێشتا لە کاردا مابوون داشکێنرا. شایانی باسە رۆژنامەکانی عێراق هەموو رۆژ بە دوورو درێژی باسی ئەو بارودۆخە سەختەی ژیانی رۆژانەی ئینگلیزیان ئەکرد.

خەرجی ئەو ملیۆن پاوەنە لەو رۆژگارە هەرە سەختو دژوارەدا رقی "ئەنجومەنی نەقابەی کرێکاران"ی ئینگلیزی هەڵساند. رۆژی چوارەی مایس ئەنجومەنی ناوبراو یادداشتێکی تایبەتی لەو بارەیەوە دایە ئەنجومەنی وەزیران، کەوا بزانم هەرڤەویش بۆ خۆی تاکە دەنگێکی زۆر نزمە لەسەر کورد هەڵی دایێ. دەقی یادداشتەکە بەم جۆرەیە:

"ئەنجومەنی نەقابەو کرێکاران ئەی کرێکارانی جیهان یەکگرن. گەورەو خۆشەویستم. ئەنجومەنی ناوبراو پێوەندیی پێوەکردم بۆ دەربڕینی ناڕەزایی لەسەر بۆمبابارانکردنی پیاوی چیایی عێراق (مەبەستی شێخ مەحمود - ک. م). ئێمە لەو باوەڕەدایین دەبوو ئەو ملیۆن پاوەنە بۆ مەبەستی ئەوتۆ تەرخان بکرایە کە لەگەڵ ج سیاسەتی حکومەتی (ئێستای) کرێکاران لە بواری کاروباری هەندەراندا بگونجایە، ج لەگەڵ ئەو بانگەوازانەماندا کە لەناو هۆڵی پەرلەماندا بڵاومان کردنەوە. لەوە دڵنیام بەڕێزتان بایەخی تەواو دەدەنە ئەم مەسەلەیە

دڵسۆزتان ت. ر. ئایۆت.

پێم وایە هەر کەسێک لەهەر رەگەزو تیرەیەک بێ راستییەکانی ناو ئەم وتارە بخوێنێتەوە، کە وەک وتمان مشتێکە لە خەروارێک، بە ئەوپەڕی قەناعەتەوە تێدەگا فڕۆکە جەنگییەکانی ئینگلیز ج گاڵتەیەکیان بە شێخ مەحمودو لایەنگرانی کردووە.

دەستڕۆیشتووەکانی کوردستان لەوە ئاگادار بکەن کە ئەوان دژی شێخن" فەرماندەی گشتیی هێزی ئاسمانیی بەریتانی لە عێراق لە راپۆرتە دوورو درێژەکەی خۆیدا بەتایبەتی ئاماژەی بۆ ئەم راستییە کردووە. لەخاڵی بیست و حەوتەمینی راپۆرتەکەیدا دەڵێ لەسەر داوای نوێنەری باڵا دەوروبەری ناوەندی تەشرینی دووەمی ساڵی 1930 بەیاننامەیەکی تایبەتیمان ئامادە کردو بە فڕۆکە بە کوردستاندا بڵاومان کردەوە تا هەمووان بە دروستی لەوە تێبگەن کە ئێمە دژی شێخین. ئەمەش پوختەی بەیاننامەکەیە:

"ج حوکمەت ج نوێنەری باڵا شێخ مەحمود بەیاخی دادەنێن لە ئاستی یاسادا. بۆیەکا پێویستی ئەزانن لە هەر شوێنێک لەناو خاکی عێراقدا بینرا بێ ئیزار بۆمبابارانی بکەن. لەبەر ئەوە گشت گوندنشینەکان ئاگادار ئەکەین کە نابێ داڵدەی شێخ مەحمود بدەن، خۆ ئەگەر هاتو داڵدەیان دا ئەوا سەرو ماڵیان ئەخەنە مەترسییەکی گەورەوە"

* * *

ئەمە بوو پوختەی مێژووی پێوەندیی نێوان شێخ مەحمودو ئینگلیزو هۆ بزوێنەرەکانی ئەو پێوەندییە. تا ئێستە چەند جارێک لە نووسین و موحازەرە تایبەتی و گشتییەکانی خۆمدا گوتومە ئەگەر بێتو کورتەیەکی ئەم زانیارییانە بدەینە ساکارترین کۆمپیوتەری یابانی لە وەڵامدا پێمان ئەڵێ ئەبێ شێخ مەحمود لە هەر عێراقییەک زیاتر رقی لە ئینگلیز بووبێ. شێخ بۆ خۆی بەشێوازێکی بەرز جارێکیان قووڵیی هەستی بەرامبەر ئینگلیز لای گەورەیەکیان دەربڕیوە. سەندرسن پاشای بەناوبانگ کە دوکتۆری تایبەتی کۆشک بوو لە یاداشتەکانیدا کە بەناوی "دە هەزار شەوو شەوێک"ەوە بڵاوی کردوونەتەوە ئەمەمان بۆ ئەگێڕێتەوە:

"رابەری شۆڕشگێر شێخ مەحمود لەدوای تەواوبوونی شەڕی یەکەمی جیهانییەوە ببووە چقڵی چاوی میری. دوای چەند ساڵێک شێخ مەحمود بەدەسبەسەری هێنرایە بەغدا. شێخ یەکێک بوو لە نەخۆشەکانم. یەکەم جار کە

موعایەنەم کرد لوویەکی بچکۆلەم لەسەر گازی پشتی بەدی کرد، کەلێم پرسی هۆی ئەو لووە چی یە وتی:

ئەوە گوللەیەکی بەریتانی یە!

شێخ لەسەر قسەکەی خۆی ڕۆیی:

ئەو گوللەیە کتو مت لەبێوەی ئینگلیز خۆتان ئەکا، ئێوە بچنە هەر شوێنێك مەگەر شەیتان لەو شوێنە دەرتان بەرێنێ"

لەگەڵ هەموونەمانەشدا ئەوانەی بۆ خۆیان پیاوی دڵسۆزی ئینگلیز بوون، یا جاروبار بە ئاشکراو زۆرجار لە ژێرەوە پشتی پشتی یان بۆ ئینگلیز ئەکرد بەراستو بە چەپدا پەلاماری شێخ مەحمودیان ئەدا، دەسە چەررەکەی خۆیان بەسەر ئەودا ئەسڕی، بەزۆری زۆرداری لەیانکردە دەسکەلای دەسی ئینگلیز. لەو بوارەدا هەستی کۆنرانەی خۆیان بە پەردەیەکی تەنکی ئیشتمانپەروەری یەکی دەسکرد دائەپۆشی و هەموو ڕاستی یە ڕەواکانیان بۆ ئەو مەبەستە هەڵئەگێڕایەوە. ئەوەی بای بیاباتەکان یەئەواری شەڕی ئەکەن هەرگیز لەوە زیاتر نی یە کە فرۆکەوانەکانی ئینگلیز سەرەتای سی یەکان بە شێخ مەحمودیان کرد. کەچی ئەو ڕاستی یە زەقە لەڕۆژی ئیمڕۆدا وا شێوێنراوە پیاو بەزەیی بەویژدانی مردووی ئەو شایەتانەدا بێتەوە کە بە ناحەق ملی خەڵکی بێ تاوان ئەکەن بە پەتی سێدارەوە. وابزانم دوای ئەوەی بەڵگەکانی ئەم بۆچوونە ئەخەمە بەرچاو ئەوساکە هەموان حەقی حوکمێکی وا نائاسایی ئەدەن.

چاوپیاخشاندنێکی خێرا بەتۆماری قسەی نایبەکاندا کە لەو ڕۆژانەدا لەهۆڵی پەرلەمان دەرحەقی شێخ مەحمود کردویانن بۆی هەیە بەڕوونی هەموو لایەنەکانی ئەم باسەمان بۆ شی بکاتەوە. لەکۆبوونەوەی چلو هەشتەمینی ڕۆژی شەممەی بیستو هەشتی مارتی سالی 1931ی "ئەنجومەنی نوێنەران" (مجلس النواب)دا هەشت پەرلەمانتار ئەوی ناشێ بەشێخ مەحمودیان کردووە، گەلێك ناوو ناتۆرەیان لێ ناوە، بەئارەزووی خۆیان پلارو تواتجیان تێ گرتووە، بێ پەروا قسەی نزمو ناشرینیان پێی گوتووە، چەندەها تۆمەتی نارەوایان بۆی هەڵبەستووە. سەلمان بەراکی نوێنەری مونتەفیكو ئەحمەد جەلیلی دیسان نوێنەری مووسل لە هەموان زیاتر هەشریان کردووە. ئەو ڕۆژە سەلمان بەراك بەجارێك خۆی گیف کردەوە، لەهۆڵی پەرلەماندا دەیئەڕاند:

" واتابن، بە فەوجێك سەرباز دەتوانین لەماوەی بیستو چوار سەعاتدا لەناوی بەرین. ئەگەر مەسەلەکە بریتی یە لە مەسەلەی شێخ مەحمودو 300 سەر ئاشێوار ئەوا من دەتوانم بە فوویەك دەریان بەرێنم".

ئەو ڕۆژە ئەحمەد جەلیلی لەهەموان زیاتر هەڵچووو بەگەرمی داوای کرد "هەموان چەك دژی ئەو یاخی یە چەپەڵە هەڵگرن"و بە توندی بەرپەرچی قسەکانی عیزەددین نەقیبی نوێنەری یاقوبەی دایەوە کە تێیدا داوای کردبوو هەوڵ بدرێ لە ڕێگەی گفتوگۆوە چارەسەرێك بۆ کێشەکە بدۆزێتەوە. جەلیلی سوور بوو لەسەر ئەوەی شێخ مەحمودو لایەنگرانی لەخوێنی خۆیاندا بگەوزێنرێن، چونکە هیچ گومانی لەوە نەبوو کە "شێخ مەحمود ئەمرازێکە لە ئەمرازەکان، بەڵام ئەمرازێکە لەو ئەمرازە وێرانکارانەی بێ شەرەفانە بۆ لێداتی ئەم وڵاتە بەکار ئەهێنرێ". سابیت عەبدولنوری نوێنەری مووسل "ئاپاکی شێخ مەحمود"ی لەوەدا وەدی ئەکرد کە یەك لەدوای یەك دژی عوسمانی یەکان و ئینگلیزەکان و ڕژێمی پاشایی ئەوسای عێراق ڕاپەڕیوە.

وا دیارە ئەکەشو هەوای وادا عەقل ئیجازە وەرئەگری، بەپێی گێڕانەوەی عەبباس عەزاوی ی شارەزا مل مەتناع سەرەك هۆزێکی لەسەر خۆو پێوەندی لەگەڵ ئینگلیزدا چاك بوو، کەچی ئەویش خۆی پێ نەگیراوەو لە عاستی خۆیەوە کەوتۆتە هاتو هاوار:

"ئەم حوکمەتە حوکمەتێکی عەرەبی ی سەربەخۆیەو هیچ کەس لە رەعی یە بۆی نی یە یاری بە چارەنووسی بکا".

لێرەدا نایبە کوردەکان وەخەبەر دێن، غیاسەددینی نەقشبەندی کە یەکێك دەبێ لە نوێنەرانی کوردی مووسل دێتە دەنگو دەڵێ قوربان ئەم حوکمەتەی جەنابتان ئەقەرموون حوکمەتی هەموانە. قسەکانی نەقشبەندی نایبە کوردەکانی تریش ئەبزوێنێ، لەخۆشی یاندا خۆیان پێ ناگیرێو بە تەنها ئەکەونە چەپڵە ڕێژان.

خوانەبێرێ.

ڕۆژنامەکان کە لە نایبەکان کەمتریان نەکرد، ئەوانیش ئەوی نەشیا بە شێخ مەحمودیان کرد: هیچ کامیان بە پێویستی نەزانی بەدووی بەڵگەیەکدا بگەڕێ بۆ سەلماندنی ئەوەی شێخ مەحمود پیاوی ئینگلیزەو بە فەرمانی ئەوان ڕاپەڕیوەو داوای مافی کورد ئەکا، ئەو مەسەلەیە بەلایانەوە هێند روونو ئاشکرا بوو هیچ پێویستی بە بەڵگەو سەلماندن نەئەکرد، رستەی قەڵەو قەڵەوی پڕ لە جوێنو پلارو تواتج جێگەی بۆ مەقاڵو لێکدانەوە نەهێشتبۆوە. تەنانەت ڕۆژنامەی (العراق)یش لەم بووارەدا درێغی ی نەکرد، هەرچەندە بۆ خۆی دەستێژی ئینگلیزو دوژمنی باوەکوشتەی هەموو ئیشتمانپەروەرێکی دڵسۆز بوو، کاتی خۆی لە شێخ مەحمود زیاتری بە سەرانی شۆڕشی بیست کرد، بەڵام لە بۆچوونێکی تەواو جیاوازەوە. تەنها لە ووتارە دوورو درێژەیدا کە ڕۆژی هەینی ی بیستو یەکی مارتی سالی 1931 دەربارەی شێخ مەحمود بڵاوی کردۆتەوە "العراق" چەند جارێك بە چەردەو چەتەو یاخیو خایەزو ئەحمەقو ئەخوێندەوارو شێت ناوی بردووە.

لە هەموو سەیرتر ئەوەیە ئەو ڕۆژنامانە جاروبار ئەقی ئەو وتارانەیان بڵاو ئەکردەوە کە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی لەندەن دەیاننوسیو بەراشکاوی سەرنجی دوژمنانەی خۆیان بەرامبەر بە شێخ مەحمود تێیدا دەرئەبڕی. بەوێنە ڕۆژنامەی "العالم العربی" سەرجەمی ئەو وتارە درێژەی گۆڤاری نیر ئیستی بڵاوکردەوە کە هەمووی هێرشە بۆ سەر شێخ مەحمودو خەفەتی ئەوە ئەخوا کە ئینگلیز سالی 1919 لەناویان نەبرد. شایانی باسە سەرەتای سی یەکان ڕۆژنامەی "تایمس" بەهەمان دەستوور رەخنەی لە شێخ مەحمود ئەگرت، ئەوەی هەر زوو سەرنجی ڕۆژنامەنوسە بیانی یەکانی ڕاکێشا.

کاتێك بەناوەرۆکی ئێشاوی ئەو هەموو تۆمەتو تواتجو پلارو جنێوانەدا دەچێتەوەو لەگەڵ ڕاستی ی ڕووداوەکاندا بەراوردیان دەکەیت لە حوکمی ڕەوای مێژوو بەولاوە هیچت بۆ نامێنێتەوە کە تێت دەگەیەنێ ئەو جۆرە توندڕەوە شۆفێنی یانە چ ئاوێکی خراپیان ڕشتو چەند لە ئاستی کوردو چارەنووسی ئەم وڵاتەدا گوناهبارن.

لەم ڕۆژانەدا لەناو هۆڵی پەرلەماندا دەنگێکی ڕەوای نزم بۆ خزمەتی حەقیقەت بەرز بۆوە، ئەویش دەنگی موزاحیم ئەمین پاچەچی بوو موزاحیم پاچەچی بۆ ئەوسای عێراق خوێندەوارێکی چالاکو سیاسی یەکی شارەزا بوو. بیستەکان چەپڕەو لەبەری ناحەزانی ئینگلیزدا چالاك بوو. بەرادەیەك ڕاپۆرتێکی تایبەتی ئینگلیزەکان دەربارەی گەورە پیاوانی عێراق ڕای لەقەڵەم داوە گوایە پڕیشکی کۆسۆلیزم تێکەڵ بە بیروباوەڕی موزاحیم پاچەچی بووە. بەر لەوەی موزاحیم پاچەچی بێتە وەزیری ڕێکخراوە کوردی یە تازە دامەزراوەکان پێوەندی یان پێوەی کرد. نوری سەعیدی دانا دەیزانی بەراکێشانی پاچەچی دەتوانێ کەلێنێکی گەورە بخاتە ناو ڕیزی ناحەزانی یەوە. سەرەتای کانوونی دووەمی 1931 نوری سەعید موزاحیم پاچەچی کردە وەزیری ئابووری، پاش ماوەیەك وەزارەتی کاروباری ناوخۆشی بەو سپارد کە تا ئەو کا" بەدەست خۆیەوە بوو. جا لە کۆبوونەوەی ڕۆژی بیستو هەشتی مارتی 1931ی ئەنجومەنی نوێنەراندا ئەو وەك وەزیری ناوخۆ ئامادەبوو، دوای هاتو هاواری توندڕەوەکان قسەی وەرگرتو لەوەڵامدا گوتی:

" دەربارەی ئەوەی نوێنەری مووسل گوتی کە شێخ مەحمود ئەمرازی دەستی هەندێ لایەنە، کەی ویستیان بەکاری ئەهێنن من پێم وایە گوتنی قسەی وا لە جێگەی خۆیدا نی یە، لەوە دەترسێم هەڵسو کەوتی ڕابردووی شێخ مەحمود پەردەی گومان بخاتە سەر ئەو تۆمەتە. چونکە هەر شێخ بۆ خۆی دژی دەسەڵاتی عوسمانیو دژی دەسەڵاتی بەریتانی لەڕۆژانی ئیحتیلالداو دژی دەسەڵاتی عێراق ڕاپەڕی، ئەو پیاوە خووی بە شۆڕشو یاخی بوونەوە گرتووە".

شێخ مەحمود تا ئێستاش لەپلارو تواتج ئاڕەوا ڕزگاری نەبووە، ماوەیەك لەمەوبەر ژمارەیەك وردەفرۆشی ئاخرزەمان بێ ئەوەی هیچ لەمێژووی شێخ مەحمودو ژیانی بزانن کەوتنە پەلاماردانی لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان، دوو ڕوناکبیری کورد، عەبدوڵلا عەبباسو موحسین تاهیر بەرزنجی لێیان هاتنە دەستو وەڵامی شیاویان دانەوە. خوا هەڵنەگرێ بەرامبەر ئەو جۆرە وردەفرۆشانە ڕۆژنامەنووسی بەویژدانی وەك حەمید مەگیەعیش هەڵئەکەوێ کە پێی وایە "تەنها کوتەیەکی شێخ مەحمود هاوسەنگی سێ کتێبە لە مێژووی ئیشتمانپەروەریدا".

ئەوی بەتایبەتی جێگەی داخ بێ ئەوەیە کە ئەو ئێشاوی تۆمەتەی دراوەتە پاڵ شێخ مەحمود لەناو کتێبی ژمارەیەکی زۆر لە مێژوونووسانی عەرەبدا جێگەی دیاری بۆ خۆی کردۆتەوە بێ ئەوەی گوێ ڕایەڵی ئیبن خەلدونی گەورە بن کە بەگەرمی داوای لە مێژوونووسان ئەکرد ئەوی لەگەڵ عەقڵو مەنتیقدا ئەگونجێ ڕەتی بکەنەوە. تا لێرەدا دێمە سەر سەرناوی وتاری ئەمجارەم کە سەرناوێکی ڕۆژنامەنووسانەیە ئەك زانستی یانەو ئەڵێم: وا دیارە ئەو کاورلکاریو راودوونانە زۆرەی فرۆکەوانە ئینگلیزەکان لە کوردستاندا ئەنجامیاندا هەموویان گاڵتەو گەپو گەمە بوون کاتیان لەگەڵ شێخ مەحمودا پێ ئەبردە سەر. بەوەی باشە ئەو تۆمەتبازانە شتێکی ئەوتۆ دەربارەی شێخ مەحمود نازانن، ئاگایان لەوە نی یە پیاوێکی قسەخۆشو نوکتەبازو قۆشمە بووە ئەگینا بەپێوە ئەچوونە سەر قورئانو دەیانگوت ئەوی لە کوردستان قەوما "بەراستی" گاڵتەو گەپو گەمە بوو لەنێوان شێخ مەحمودو فرۆکەوانە ئینگلیزەکاندا.

# چاوپێکەوتنێك لەگەڵ

## د. کەمال مەزهەر

ئامادەکردنی:
شیلان ئەحمەد



شیلان: حەزدەکەین سەرەتا باسی ژیانی خۆتمان بۆ بکەی، لەکوێو کەی لەدایکبوویت، باوکت چ کارو چەند منداڵی هەبووە..؟

کەمال مەزهەر: لە 14ی شوباتی (1937) لە ئاغجەلەر لە کەرکوك لەدایکبووم؛ بەلام لە پێناسەکەمدا لە دایکبووی سلێمانیم باوکم فەرمانبەر بوو، سێ خوشكو برایەکم هەیە، باوکم کە کۆچی دوایی کرد معاون شورتە بوو لە ساڵی 1953.

شیلان: چۆن مێژووت هەڵبژارد؟

کەمال مەزهەر: لە پۆلی دووی ناوەندی بووم مامۆستایەکمان هەبوو ناوی (حەمە ڕەش) بوو خەڵکی کۆیە بوو مێژووی پێدەوتینەوە، وانەکەی زۆر بەلەزەت دەوتەوە زۆر پاراو بو، ئەوکاتە سەرەتای خۆشەویستیم بوو بۆ مێژوو. بەرلەوەش کە باسی (ئەمین زەکی بەگ) دەکرا وەك مێژوونوس زۆر سەرنجی رادەکێشام. ئەوەی راستی بێت مامۆستا ئەمین زەکی بەگ دوورە خزمایەتیەك هەبوو لە گەڵ دایکما. وە لەپۆلی پێنجی ناوەندی بووم دوو کتێبی مێژووم خوێندەوە هی دوو مێژوونووسی گەورە (د. مجید خدوری) وە (د. زکی صالح) کە ئەوەندەی تر حەزم لەمێژوو کرد.

شیلان: باسێکی هەردوو دکتۆراکەت؟

کەمال مەزهەر: لەسەرەتادا چومە بەشی مێژووی کۆلیژی پەروەردە کە ئەوسا پێیان دەوت (دار المعلمین العالیە) لە خوێندندا زۆر باش بووم. لە پۆلی یەك لە کۆلیژی پەروەردە هەستمکرد کە دەبێ ڕوویکەمە مێژووی کورد راپۆرتێکی زانستیم نووسی دەربارەی مێژووی کورد، لەپاش شۆڕشی گەلاوێژ (1958) لە ساڵێك کۆلژیم تەواو کرد، دوای ئەوە لە ساڵی (1960) چووم بۆ شورەوی. حوزەیرانی 1963 دکۆترای دووەمم وەرگرت لەسەر ئاوك (علوم) بوو، لە چەند وڵاتێك ئەو بڕوانەمەیە هەیە، لە ئینگلتەرەو ئەڵمانیا پێی دەوتری خوێندنی دوای دکتۆرا نامەی دکتۆرای دووەمم سی پەرگە نزیکەی هەزار لاپەرە دەنگێکی باشی دایەوە؛ چاپەمەنییەکانی سۆڤیەت لەسەریان نووسی وە پاش دە ساڵ کۆڕێکی ڕێزگرتنیان بۆ بەستم لە یەکێتی نووسەرانی عێراق لەوێ باسی ئەوەم کرد کە چۆن لە وڵاتی شورەوی ئەوەی دەمویست لەرووی زانستەوە لەبەردەمما بوو، گەورەترین کتێبخانەو سەرچاوەی دەگمەنو مەودای بڵاوکردنەوەی زۆر.

شیلان: سەرچاوەی جیاوازمان هەیە باس لە ڕەچەڵەکی کورد یاخود ئەصلی کورد دەکەن، جەنابتان ئەصلی کورد دەگەڕێنیتەوە بۆ کەیو چۆن پەیدا بوون؟

کەمال مەزهەر: دەربارەی رەگەزی کورد وەك ووتت سەرچاوەی جیاوازو زۆرمان هەیە لە هەموان باشتر ئەمین زەکی بەگ بەشێوازێکی زانستی باسەکەی هەڵسەنگاندوە. شارەزایم لە مێژووی نوێو هاوچەرخ نەك

لەمێژووی کۆن تەنها وەک ڕووناکبیری وەک شارەزایەک ئەوەندە هەیە کە ڕاوبۆچوونەکەی ڕۆژهەڵاتناسی گەورە (مینۆرسکی) دەربارەی ڕەگەزی کورد کە لە ساڵی 1927 لە ئەنسکلۆپیدای ئیسلام بڵاویکردۆتەوە، کە دەڵێ (میدییەکان باپیرە گەورەی کوردن) ئەو ڕایەم لەهەر ڕایەکی تر بەلاوە پەسەندترە. بەڵام نابێ ئەوەش لەیادبکەین کە بەر لە هاتنی میدییەکان بەهەزار ساڵ گەلی نەتەوەی تر لەناو کوردستاندا ژیاون وەک بۆتییەکان و لۆلۆو کاشییەکان و خورییەکان و هتد کە هەڵبەت ئەوانەش بەجۆرێک لەجۆرەکان دەبێت لەناو بۆتەی میدییەکاندا توابنەوەو بەهەموویان ئەم گەلی کوردەی ئێستایان دروستکردبێت. تەنانەت ئێستا پێموایە ڕووناکبیری ئەوتۆ هەیە کە ڕەگەزی کورد لە سۆمەرییەکان کە کۆنترین دەستەی ناوچەکەن جیاناکەنەوە. هەرچۆن بێت ڕووناکبیری کورد هەقی خۆشیانە کە زۆر بایەخدەدەن بە ڕەگەزی کورد یا بڵێین بەرابردووی نەتەوەکەیان ئەمە لە شوێنی خۆیەتی. بەڵام گریمان کە مێژووی ڕابردووی کورد زۆر لێڕین نییە یان بابڵێین دەوری ژیاری یان شارستانێتیان زۆر دیارنییە وەک نەتەوەپەرستانی گەلانی تر دەڵێن. بەڵام ڕاستییەک لە ئارادایە کە ئیمڕۆ لەسەر نەخشەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نەتەوەیەکی گەورەی (30) ملیۆنی هەیە کە مافی ژیان و سەرفرازیان هەیە جا با ڕابردووی هەرچۆنێک بووبێت هەرچەندە لەڕاستیدا گەلی کورد خاوەنی ڕابردوویەکی پڕ لە شانازیشە.

شیلان: نووسینەکانت هەمووی لەسەر مێژووی نوێیە وەک خۆت ووتت شارەزایت زیاتر لە مێژووی نوێدا هەیە بەڵام ئایا هەوڵتنەداوە نووسینێت هەبێ لەسەر مێژووی کۆن؟ هەستدەکەم لەسەر ئەمارەتی بابان مێژوونووسمان کەمە کە لێکۆڵینەوەیان کردبێت، جەنابتان هیچ نووسینێکتان هەیە لەسەری؟

کەمال مەزهەر: مێژوو دەریایەکی ئێجگار بەرفراوانە هەر کەسە دەتوانێت بە چەمکێکی ئەو مێژووەوە خەریکبێت جاران کارێکی وا دەلوا کە بەسەرجەم و سەرانسەری هەموو ڕووداوەکانی ئەو مێژووە لەدرێژەمانەوە خەریکبیت بەڵام ئێستا ئەو کارە لەوێزەی کەسدا نییە. من بەش بە حاڵی خۆم تا ئێستا فریانەکەوتووم لە بەشێکی کەمی مێژووی نوێ و هاوچەرخی کورد زیاتر بکۆڵمەوە. ئێستا بەچاوی خۆت کتێبخانەکەم دەبینی کە بریتییە لە هەزاران لە کتێب و سەرچاوەی هەمەجۆر کە بەشێکی زۆریان دەربارەی مێژووی کوردن و شتی زۆر دەگمەنیان تێدایە کە هەموویان پێویستیان بە لێکۆڵینەوەیە سەربارەی ئەو کتێبانەی دەیبینیت هەزارەها بەڵگەنامەی دیپلۆماسی و شتی تری تێهنیم هەیە کە بەشی هەرە زۆریان دەربارەی کوردن وە بەشێکی زۆر لەو بەڵگەنامانە هی ئینگلیزەکانن بایەخی ئەم جۆرە بەڵگانامانە بێئەندازەیە. جا من خەو بەو ڕۆژەوە دەبینم کە تیایدا فریابکەوم لەرێگەی ئەو بەڵگنامانەوە لە چەند لاپەڕەیەکی تری مێژووی نوێ و هاوچەرخی کورد بکۆڵمەوە.

لە نووسینێکی خۆمدا ووتومە وێنەی ڕاستەقینەی ڕاپەڕاتی کوردی وەک بەدرخانییەکان و شێخ سەعیدی پیران و شێخی بەرزنجەو قازی موکریان و ڕاپەڕاتی بارزان و ئەوانی تر وان لە دووتوێی ئەو بەڵگنامانەدا ئەوەندە هەیە دەتوانم بڵێم وەک مێژوونووسێک شانازی بە خەباتی نەتەوەکەمەوە دەکەم هەرچەندە ئەو خەباتەش بێ کەموکورتی و بێ هەڵە نییە، بەڵام ئەگەر ئەو خەباتە سەختە نەبووایە دەمێک بوو نەتەوەی کورد ببووە بەشێک لە ڕابردوو. من لەو قۆناغەوە سەیری مێژووی نوێ و هاوچەرخی کورد دەکەم لەگینا سەرەتا لەهەر لایەنێکی تر زیاتر حەزم لە توێژینەوەی مێژووی کۆنی کورد دەکرد، تەنانەت بەشێک لە ووتارەکانی زووم بۆ ئەو لایەنەی مێژووی کورد تەرخانکراوە، کە چووم بۆ وڵاتی شوورەوی ئامانجم وابوو لەسەر مێژووی کۆنی کورد بنووسم بەڵام لەرێ خوالێخۆشبوان د. ڕەحیمی قازی و د. عەلی گەلاوێژ قەناعەتیان پێکردم کە بۆ ئیمڕۆی نەتەوەی کورد هەڵبدەم لێکۆڵینەوەی مێژووی نوێ و هاوچەرخی کورد بایەخێکی گەورەی هەیە لەگەڵ ئەوەشدا بەپێی توانا بایەخم بە مێژووی بابانەکان داوە هەر سەرچاوەیەک دەربارەی مێژووی بابانەکان بێت هەوڵمداوە وەستیبهێنم.

شیلان: لە ڕابردوودا بە تەفسیری ئایدۆلۆژیا هێندێک بابەتی مێژوویت ساغکردۆتەوەو وەک شۆڕشی بیست و ژیانی کوردی سۆڤێت و بەشداری کورد لە کوشتاری ئەرمەندا. ئایا بە پێویستی نازانی ئێستا پیایاندا بچیتەوە، دەستکاریان بکەیت؟

کەمال مەزهەر: من شانازی بە نووسینەکانی خۆمەوە دەکەم هەمیشە هەوڵمداوە چەند بتوانم بێلایەنانە لە ڕووداوەکان بکۆڵمەوە تەتەڵەیان بکەم، چونکە لەو باوەڕەدام بەو جۆرە دەتوانم خزمەتی گەلی کورد بکەم وابزانم هەر ئەو بێلایەنییە یان ئەو کیانە زانستییە کە کارێکی وایان کردووە نەک تەنها لای کورد بەڵکو لای غەیرە کوردیش مەقبوولیم. ڕەنگە ئاگاداری کە ژمارەیەک لە بەرهەمەکانم کراون بە ئینگلیزی و فەرەنسی و فارسی و تورکی، تەنانەت بەرهەمی واشم هەیە کە لە دەرەوە بە پیتی لاتینی دیسان چاپکراونەتەوە وەک ئەو کتێبەم کە بەناوی "چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد"ە. زۆربەی ئەو بەڵگەنامانەی کە ئەیدۆزمەوە بۆچوونەکانی ڕابردووم زیاتر دەچەسپێنن لەبەر ئەوە لە هیچ نووسینێکم پەشیمانیم هەڵبەت بەپێی یاسای زانست نووسینی ئەمڕۆ لە نووسینی دوێنێ باشترە بۆیە ئەگەر بە بەرهەمێکمدا بچمەوە دوورنییە دەوڵەمەندتری کەم، وە زۆر بەداخەوە مەودای ژیان زۆر کورتە هیچ نووسەرێک ناوەڕناکەم هەموو ئەو شتانەی لە مێشکیاندایە یان پرۆژەیان بۆ داناون فریابکەون بیان نووسنەوە.

شیلان: هەستناکەیت کە پەلە لە نووسینەکانتا هەیە؟

کەمال مەزهەر: بڕیاری ئەوە بۆ من نییە بۆ خوێنەرانە، هەمیشە هەوڵئەدەم نووسینەکەم لە هەموو ڕوویەکەوە تەواوبێ، لەوەتەی بووم بە قوتابی لە کۆلێژی پەروەردە زۆربەی کاتم لەناو کتێبدا بردۆتە سەر ئێستاش ڕۆژانە بەر لە مەلابانگدان هەڵئەستم و دەستئەکەم بەکار. من ئەزانم زۆرکەس پەلە ئەکەن لەوەشدا گلەییان لێناکرێ بەڵام من سەروەت و سامانێکی ئەوەندە زۆرم لەبەر دەستدایە کە تارادەیەکی زۆر یارمەتیمئەدەن بەرهەمەکانم کامڵێن لەگەڵ ئەوەشدا ئەو حوکمە هەرهی خوێنەرانە.

شیلان: تۆ زۆربەی کاتت بۆ مێژووی عێراق تەرخانکردووە بەردەوام سەرپەرشتی قوتابیانی خوێندنی باڵادەکەی، ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بەتەواوی خۆت بۆ مێژووی کورد تەرخانبکەیت کە کەم کەس ئیشی تێدا دەکەن؟

کەمال مەزهەر: مێژووی کورد لەسەرووی هەموو شتێکەوەیە بەڵام سروشتی کارەکەم کارێکی ئەوتۆی کردووە کە زۆربەی قوتابیەکانم خەریکی مێژووی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی نزیک و ناوەڕاست بوون وەک مێژووی نوێ و هاوچەرخی ئێران و عێراق، هەمیشە ئاواتە ئەوەبووە کە دەرس بە قوتابیانی کورد بڵێمەوە، بەداخەوە دەرفەتی تەواوی ئەوەم بۆ هەڵنەکەوتووە کە لە هەندەران لە ساڵی 1970 گەڕامەوە تەنها یەک ساڵ ڕێگەم پێدرا لەبەشی کوردی کۆلێژی ئاداب دەرس بڵێمەوە، یەکێ لە قوتابییەکانم د. شوکریە ڕەسوڵ بوو دەتوانی لەو بپرسی کە ئەو قوتابیانە چەند بە پەرۆشبوون کە لە پۆلی چواریش هەر من مێژوویان پێبڵێمەوە.

شیلان: کتێبەکانی " قضايا دوليه في شرق الاوسط والطبقه العامله العراقيه و تاريخ ايران الحديث والمعاصر وثوره العشرين" ئەمانە پەیوەندییەکی وایان بەمێژووی کوردەوە نییە وە کاتێکی زۆریان بردوی، بۆچی؟

کەمال مەزهەر: خۆی شتێکی زۆر باشە گەر مێژوونووس بتوانێ لەچەند دەرگایەک بدات لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵمداوە بەپێی توانا کە ئەو بابەتانە دەربارەی کورد نین جێگە بۆ مێژووی کورد بکەمەوە تیایاندا. بەشێ لەو بەرهەمانەم وەک دەرس ڕێوتنەوە کەشتەکە کاملبووەو بە پێویستم زانیوە ئەقەوتێ بڵاومکردونەتەوە، سەرباری ئەوە من گەر بەوردی دەربارەی میکافیلی بنووسم یان دەربارەی سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەڵبەت بەوجۆرە سەرنجی خوێنەرانی کوردیش ڕادەکێشم هەر لەبەر ئەوەشە بەشێ لەو کتێبە عەرەبیانەی نووسیومن کراون بە کوردی، دوانیان کاک فوادی مەجید میسری کردوتی بەکوردی "چینی کرێکاری عێراق و ڕێنسانس" هەروەها چیرۆکنووسی بەناوبانط کاک حسێن عارف ئەوکتێبەی کە لەسەر میکافیلی نووسیبووم کردوویەتی بەکوردی، خۆزگە هەموو ڕووەکانی ژیان وەها لەباربوایە بۆم کە بمتوانیایە سەرجەمی نووسینەکانم بۆ مێژووی کورد تەرخانبکەم. تۆ نابێت ئەوەت لەبیربچێت من مامۆستای زانکۆم وە لەزانکۆی هەودای لێکۆڵینەوە دەربارەی مێژووی کورد یەجگار یەجگار تەسکە بەپێچەوانەی ئەدەبو زمان کەبەشی تایبەتیان بۆ تەرخانکراوە

شیلان: لەمێژە ئەڵط هەیە کتێب لەسەر سمکۆو کوردستان لەنێوان یەکەم و دووەم جەنگی جیهانیدا بڵاوبکەیتەوە، بۆچی بڵاویان ناکەیتەوە؟

کەمال مەزهەر: گەلێ بەڵگەنامەی بایەخدارو ورتم دەربارەی سمکۆی شکاك دۆزیوەتەوە، هەر بۆ وێنە لەم رۆژانــەدا نامەیــەکی دەگمــەنی سمکۆم دۆزیــەوە کــە بــۆ بایــەکر ئاغای پشدەری نووســیوە، لەبــەر ئــەوە یــەکێ لــە پرۆژەکــانم دانــانی کتێبێکی گەورەیــە لەســەر سمکــۆ ئەگەر تەمەن و ژیان دەرفەت بدەن.

شیلان: بەم دواییە بەڵگەنامەی ئینگلــیزیت دەســتکەوتووە؟ وە ئایا ئیشیان لەسەر ئەکەیت؟

کــەمال مەزهــەر: بەهــەزاران بەڵگەنامــەی بــەریتانی هەیــە، ئــەو بەڵگەنامانە سامانێکی کەمهاوتان، هەندێ مێژوونووس پێیان وایە کە مێژووی راستەقینە ئەو مێژووەیە کە پشت بە بەڵگەنامە دەبەستێ، من بەردەوام خەریکی ئەو بەڵگەنامانەم لــە رێکخســتنیان، لێکۆڵینــەوەیان، تەرجەمەی بەشێکی زۆریان هــەروا کــارێکی ئاســان نییــە. وە وێنــەی راســتەقینەی زۆر لــە نیشــتمان پــەروەرانی کــورد وان لــەو بەڵگەنامانــەدا بــۆ نمونــە (ڤیڤیــان هۆلد) کە سکرتێری نوێنەری باڵای بەریتانیا بــوو لــە عێراق لــە ساڵی 1931 راپۆرتێکــی هێنــد نــازداری دەربارەی شێخ مــەحمود نووسیوە کە هیچ کوردێکی دڵسۆز نەیتوانیوە تــا ئێســتا شــتێکی وا نــازدار بنووسێ. ئەوە چەند ساڵێکە پێمەوەم کە بڵاوبکەمــەوە، بــەڵام بەداخــەوە ســەرقاڵی دەرفــەتی ئــەو کــارەی نەداوم، یان وێنەی سەید ئەحمەدی خانەقاو رەشید جەودەت و مەحمود جەودەت و سمایل بەگی رەواندزی و سمایل حەقی شاوەیس و تۆفیق وەهبی و رەفیق حلمی و مــەلا فــەنی هــەولێری و مــەلای گــەورەی کۆیــەو گەلێکی تر لەو بەڵگەنامانە جێگەی شیاویان هەیە کەوامان لێدەکەن ئەو زاتانــە زیــاتر بناســین. نمونەیــەکی ســەیرت پێبڵێــم ئــەویش دەربــارەی دیوانی "حــەمدی"یــە کــە ماوەیــەك لەمەوبــەر لــە فایلــەکانی وەزارەتــی کاروباری ناوخۆدا دۆزیومەتەوە کە بەدوورودرێژی باسی ئــەو شــاعیرە گەورەیــەمان دەکــات کــە چــۆن لــەکۆتایی بیســتەکاندا یــان لــە ســــەرەتای ســــیەکاندا مــــەلا نەجمەدینی بەناوبانگو هەوڵی داوە چاپیبکات بەڵام رێگەی پێنــەدراوە لەبەر ئەو سۆزی کوردایەتییەی کە لــە شــیعرەکانیدا هەیــە؛ تەنانــەت بەشێك لــەو دێــرە شــیعرانە لــەناو فایلەکــەدا کــراون بــە عــەرەبی. باوەرناکەم کەسێك لە شارەزایانمان ئاگاداری ئــەو راســتیەبن. وە هــەر لــەناو ئــەو بەڵگەنامانــەدا دەســتو خەتی پیرۆزی رابەران و روناکبیرانی کــوردم دەســتکەوتووە، ماوەیــەك لەمەوبــەر ئــەو داخوازیــەم دۆزیوەتــەوە کــە لــەناوەندی بیســتەکاندا رۆژنامــەنووس و مێژوونووسی بــەناوبانگ حســێن حوزنی موکریانی بەدەستو خەتی خۆی پێشکەشیکردووە.

شیلان: بۆچــی بایــەخت بــە بیرەوەری بە ساڵچووەکان ئــەداوە وەك سەرچاوەیەکی مێژوویــی، لــە کاتێکدا کورد بەشی هــەرە زۆری بەڵگەنامەکانی خۆی لەدەستداون؟

کەمال مەزهەر: زۆرم بایەخداوە بە بیرەوەری، ئەوانەی تــۆ پێیــان دەڵێــیت بەســاڵاچووەکان ســاڵی 1970 هــەر کە گەرامــەوە یەکســەر دەستمکرد بە تۆمارکردنی بەشێك لــە بیرەوەریــەکانی سمــایل حــەقی شــاوەیس و فــواد مەســتی و بەشێکیشــم لــە بیرەوەریــەکانی ئیحســان نــوری پاشــا تۆمــارکرد. ســەرباری ئــەوە گــەلێك بــە بیرەوەریــەکانی لیــوای خانەنشــین "فوئــاد عــارف"وە خــەریکبووم وە بەرگی یەکەمی لەژێر سەرپەرشتی مندا ئامادەکرا. جگە لەوە ئێستا بە بەرگی دووەمی ئــەو بیرەوەریانــەوە خــەریکم کــە لــە (7) شــریتدا تۆمــارمکردوون. ئەمــە چــەند ساڵێکیشــە بــە بیرەوەریــەکانی ئەحمەد موختار بابانەوە خەریکم کــە پێموایــە لــەم چەندانــەدا تەواویاندەکەم و بەرهەمێکی بەنرخ دەبێــت بــۆ مێــژووی هاوچــەرخی رۆژگاری پاشایی لەعێراق؛ بەشێك لــەو بیرەوەریانــەی مــن ئامــادەمکردوون رۆژنامــەی "الحیــاە"ی لــەندەنی زۆر بــە بایەخــەوە دوو ژمــارەی خۆیــدا بڵاویکردنــەوە کــە دوو لاپــەڕەی گــەورەی ئــەو دوو ژمارەیــەیان پڕکردۆتــەوە،. بڕوابکــە لــەوەزیاتر فریاناکەوم، من ئێجگار هەست بە ماندووبوون دەکــەم، بــەیانی نییــە گوێم لەدەنگی مەلای مزگەوتەکانی بــەغداد نــەبێ، کــە خــەڵك دەچنــە مزگــەوت بــۆ نوێــژ منیــش لــە کتێبخانەکــەی خۆمــدا خــەریکی نوێژکردنم بە تایبەتی بۆ مێژووی گەلی کورد.

شیلان: چۆن کوردناسی بیانی هەڵدەســەنگێنی. روس و ئــەوروپی بۆچونــی کامیــان زانســتی تــرو واقیعی ترە؟

کــەمال مەزهــەر: کتێبێکــی "تۆمابوا" کوردناسی فەرەنسی لەم چەندانەدا لــە هــەولێر بــە عــەرەبی چاپکراوە پێشەکی ئەو کتێبە من نووســــیومە زۆر حەزدەکــــەم بیخوێنیتــەوە چونکــە وەڵامــی ئــەم پرســیارەتی تێدایــە. ئێمــە زۆر قــەرزاری کوردناســانین جــا ئــەوان روس بن یان ئینگلیز یان ئــەڵمانی یــان هــەر میللــەتێکی تــر ئــەوان خزمەتێکی ئێجگار گەورەی زمان و ئــەدەب و مێــژووی گــەلی کوردیــان کــردووە هــەر بــەم بۆنەیەشــەوە ئەوەشت وەبیردێنمــەوە کــە لــەدوا ژمارەی رەنگین وتارێکم لەسەر ئەو فەرمەنگە نایابە بڵاوکردۆتــەوە کــە ئەندازیار "صلاح سعدلله" دایناوە لەوێشــدا وەڵامــی ئــەم پرســیارە ئەخوێنیتەوە.

شیلان: لەکتێبی کوردستان لــە ساڵەکانی جــەنگی جیهانی یەکــەم کاتــێ باســی کوشــتاری ئەرمــەن دەکەیت بەتایبەتی دیوە رەشەکەیت ســەبارەت بــە بەشــداری کــورد باسکردووە. لەمەشــدا هــەوڵتداوە رای پێشــکەوتنخوازی خــۆت دەربخــەیت، لــەکاتێکدا گــەلی کوردیش دەوریان لە رزگاریکردنی ئەرمــەندا هــەبووە، بیرەوەریــەکانی میجــەر نوئیــل ئەوانــەی کــەکراون بــەکوردی و هــەروەها ئەوانــەی کــە نەشکراون چەندین نموونەی لەسەر دەوری پیاوانەی کورد تێدایە؟

کــەمال مەزهــەر: لــە راســتیدا مێــژووی کــورد بــەهۆی کوشــتاری ئەرمــەن لــە رۆژئــاوادا زۆر شــوێندرابوو. مــن لەوبەشــەی کتێبەکەی خۆمدا هەوڵمداوە بەپێی توانا هەموو راستیەکان نیشانبدەم؛ ئێســتاش بیرمــە یــەکێ لــە مامۆستاکانم هاتەســەرم زۆر بــە



کەمال مەزهەر لەکۆڕێکی زانستیدا

تورەیی لێی پرسیم: کەماڵ ڕاستە تۆ نوسیوتە کەکورد ئەرمەنیان کوشتووە؟ لەوەڵامدا پێموت: بەڵێ مامۆستا ڕاستە چونکە کورد ئەرمەنیان کوشتووە بەڵام وادیارە جەنابت کتێبەکەمت نەخوێندۆتەوە چەند خۆشدەبوو بە هەستێکی زانستیانە وەڵامی ئەو بەشەی کتێبەکەمت بدایەتەوە. من لەو بەشە بە دروستی وتومە کە کورد داردەستێکی بێتواناو بەدەست تورکە شۆڤێنیەکانەوە، وە هەر لەوبەشەی کتێبەکەم بە دوورودرێژی باسی ئەوەم کردووە کە چۆن کورد هەمان کات دانەی گەل ئەرمەنیان داوە، کێشەی خوێندەوارە هەست ناسکەکانمان ئەوەیە دەیانەوێ هەر بە شانازیاهوی گەلی کورددا هەڵبدەن لەکاتێکدا کوردیش وەک هەموو گەلانی تری گێتی کەوتۆتە هەڵەوە، وە نابێ مێژوونووس چاو لەو هەڵانە بپۆشێ تا یاریدەبدرێ بۆ دووپاتبوونەوەی: ئەوەی بۆ من شانازییە کە ئەو بەشەی کتێبەکەم بوو بەباسی نامەیەکی ماجستێری سەربەخۆ لە زانکۆی سۆربۆنی فەرەنسی.

شیلان: ئایا ئەو هەڵانەی کوردلە مێژوودا تۆماریکردوون بەڕای جەنابتان دووبارە بوونەتەوە گەر دووبارە بوونەتەوە هۆی دووبارە بوونەوەیان چییە؟

کەمال مەزهەر: هەموو هەڵەیەکی مێژووی بارودۆخی تایبەتی خۆی هەیە، سەرباری ئەوە سەرنج دەربارەی هەڵە لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت لەوانەیە ئەوەی بەلای منەوە هەڵەبی لەلای یەکێکی تر وانەبێ، بەڵام هەرچۆنێک بێت نەبێت مەبەستی سیاسی لەگەڵ هەڵسەنگاندنی مێژوویدا تێکەڵ نەکرێت. لەوانەیە ڕابەرێکی سیاسی ناچاربێت هەنگاوی یان چەند هەنگاوێ لەبەردەمی نەیارو دوژمندا پاشەکشێ بکات بۆ مەبەستێکی گەورە. هەر بۆ نموونە لینین لەو بڕوایەدا بوو کە دەبێ لە ساڵی 1918 تەنازولێکی گەورە بدات بە ئەڵمانەکان و دەست لەنزیکەی 150 هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەی وڵاتی شورەوی هەڵبگرێ لە پێناوی پاراستنی دەسەڵاتی بەلشەفیەکان. بەپێی بۆچوونی خۆی سیاسەت بێ مساوەمە نابێت تەنانەت پێغەمبەر گەلێ جار لەپێناوی ئیسلامدا مساوەمەی گەورەی کردووەو چاوی لەکوشتنی حەمزەی مامی پۆشیوو دەستی خستە ناو دەستی ئەبو سوفیان کە یەکە دوژمنی گەورەی ئیسلام بوو گرنط ئەوەیە سیاسی تاکتیک بگۆڕێ لە پێناوی بەرژەوەندی گشتی بەڵام بەهیچ جۆرێ توخنی خاڵە سەرەکیەکانی ستراتیج نەکەوێت ئەمیان دەبێت نەگۆڕێت.

شیلان: بەڕای تۆ کورد لەچ سەردەمێکدا ئەوپەڕی دەسەڵاتی هەبووەو لەدەست خۆی داوە؟

کەمال مەزهەر: کورد لە ڕابردوودا لەسەردەمی کۆندا وە لەسەردەمە ناوەتیەکاندا هەمیشە دەسەڵاتی خۆی هەبووە، بوونیەکان بۆ ماوەی 400 ساڵ فەرمانڕەوایی باشووری عێراقیان کردووە، میدیەکان لەگەڵ بابلیەکان دەستیان تێکەڵکردو ساڵی 612ی پێش زایین تەختو تاراجی ئیمپراتۆریەتی ئاشووریان تەفروتوناکرد. کورد تا ناوەندی سەدەی نۆزدەهەمین وەک هەموو گەلانی تر میرنشینی خۆی هەبووە، بەڵام بەختی کورد لەئاستی جوگرافیادا نەیهێنا، لەدوای شۆڕشی پیشەسازییەوەو لەدوای ئەوەی نەتەوەپەرستانی گەلانی دراوسێی کورد دەسەڵاتیان وەرگرت لەوساوە کلۆڵەی ئەم گەلە کەوتە لێژی، پێشوایە سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی 1917 لە ڕوسیا بۆ هەمووان خێربدایەوە تەنها بۆ کورد نەبێت، چونکە تەنانەت ئەوانیش ئامادەنەبوون دڵی دەسەڵاتدارانی ئەو گەلانەی کورد لەگەڵیاندا دەژیان لەخۆیان برەنجێنن. بەداخەوە خەباتی گەلان تا بێت سەختتر دەبێت بۆیە هیچ گەلێک بێ دەستی یاریدەو پشتگیری نەگەشتۆتە ئەنجام، جاری وا هەبووە ڕاپەڕینێکی گەورەی کورد ناوچەیەکی بەرفراوانی هەژاندووە کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەدەگمەن ڕۆژنامە ئەوروپاییەکان ئاوڕیانلێداوەتەوە.

شیلان: ڕاتە بەرانبەر ئەو ناودارانەی خیانەتیان تۆمارکردووە لەمێژوودا لەپێناوی بەرژەوەندی خۆیان چییە؟

کەمال مەزهەر: هەڵبەت ئەو کەسەی خیانەت لە مێژووی گەلەکەی دەکات حوکمی ڕای گشتی و مێژوو بەسەریدا ئاشکرایە، لێرەدا سەرگوزشتەیەکی فۆلکلۆری کوردیم وەبیردێتەوە کە لە ڕاستیدا ڕوویداوەوکاتی خۆی کوردەکانی وڵاتی شورەوی بۆیان گێڕامەوە پوختەی ئەو سەرگوزشتەیە ئەوەیە کە دەڵێ: (لەڕاپەڕینەکانی کوردا دژی عوسمانیەکان کوردێک دەکەوێتە داوی خۆفرۆشییەوە بەڵام هەر زوو شۆڕشگێڕان دەستگیریدەکەن و لە گوندەکەی خۆی دەستەدەکەن بە دادگاییکردنی، هەریەکەی حوکمێکی بۆ پێشنیازدەکات، یەکێ دەڵێ: دەبێ هەموو لەشی لە هەنگوێن هەڵسوێن و لەبەر گەرمای ڕۆژدا بە درەختێکەوە بیبەستینەوە تا ئەوپەڕی ئازار بەدەست مێش و مەگەزەوە بچێژێ، یەکێکی تر دەڵێ: با لاقێکی ببەستین بە وڵاخێکەوەو لاقەکەی تری بە وڵاخێکی ترەوەو بەناو گوندەکەدا ڕایکێشین تا هەڕڕوون بە هەڕوون دەبێت، بەوجۆرە هەریەکەی جۆرە سزایەکی بۆ پێشنیازدەکات، لەناو هەمووانیدا پیرەمێردێک دەڵێ: پێشنیازی من ئەوەیە کە هیچی لێنەکەین و بەرەڵاییکەین با بەسەر شۆڕی لەناوماندا بژی و بەو مەرجەی ئیتر هیچ کەسێ لەئێمە ماڵی خۆی بەناوی ئەوەوە نەنێت، واتە ناوەکەی لەنەوەی خۆمان حەرامبکەین ئەوە گەورەترین سزایە).

ئەوەندەش هەیە دەبێت مێژوونووس لە حوکمەکانیدا پەلەنەکات و ووردبین بێت و هەموو لایەنەکانی هەڵسەنگێنێ پاشان حوکمی ڕەوای خۆی بدات. سالەهای ساڵە فەرەنسیەکان میرابۆیان بە نیشتمان پەروەر دادەناو بە پێچەوانەی ئەمیشەوە سەیری تالیرانیان دەکرد، کەچی دوای دەرکەوتنی هەموو بەڵگەنامەکان و ساغبوونەوەیان هەموو بەسەرهاتەکان و وێنەکە ئاوەژوو بۆوە میرابۆ لە خانەیەکی نزم و تالیرانیش لەخانەیەکی بەرزدایە. باری میللەتی کوردیش لێجگار ناسکە لەبەر ئەوە دەبێ ئێمە لە حوکمەکانماندا هەموو ئەو لایەنە قورسانە وەبەرچاوبگرین کە کار دەکەنە سەر ڕەوتی ژیانمان، واتە نابێت لە هەڵسەنگاندنماندا زۆر توندڕەوبین هەروەک چۆن نابێت چاو لە خیانەتی کەس بپۆشین. من لەم چەندانەدا وتارێکم دەربارەی موشیری حەمەی سلێمان بڵاوکردەوە لە وتارەکەدا ڕەخنەم لەخۆم گرتووە چونکە بە وردی لەنامەی دکتۆراکەمدا ئەوری ئەو پیاوەم هەڵنەسەنگاندووە ئەو پاشگەزبوونەوەشم لە خۆدا نەبووە ئەنجام دۆزینەوەی چەند بەڵگەنامەیەکی بایەخدارو پێداچوونەوەیەکی ووردیشوو بە حوکمی ڕابردووی خۆمدا کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەک لە ڕوناکبیرە دڵسۆزەکانی کورد ئەو وتارەی منیان لاپەسەند نەبووە، جا لێرەدا دەمەوێت بڵێم هەموو دڵسۆزێ دەبێت دڵی بەوە خۆشبێت کورد خۆفرۆشێکی کەمتربێت چونکە بەداخەوە لەسەر خایەن و خۆفرۆش یەکمان نەکەوتووە.

شیلان: موشیری حەمەی سلێمان بە بیروەری زۆر کەس لەوانەیە ئەحمەد خواجەو ڕەفیق حیلمی لەشەڕی دەربەندی بازیاندا هاوکاری ئینگلیزی کردووە، دیارە ئەو هێزی سەرەکی شکانی شێخ مەحمود نەبووە لەو شەڕەدا، خەڵک زیادەڕۆییان کردووە کە بەتاکە هۆی سەرنەکەوتنی شێخیان داناوە بەڵام ئەوە هیچ لەو ڕاستیە کەمناکاتەوە کە ئەو خیانەتی لەمیللەتەکەی کردووە، ئەو بەڵگەنامانە چین کە وای لێکردوی بەرگری لە موشیر بکەیت و ڕەخنە لەخۆت بگریت؟

کەمال مەزهەر: موشیری حەمەی سلێمان خۆفرۆش نەبووە: سەرکردەیەکی مامناوەندی هەمەوەند بووەو وەک زۆربەی سەرکردەکانی تر ڕەفتاریکردووە، بێگومان ئینگلیز هیچ پێویستیەکیان بەموشیر نەبووە تا بتوانن بەسەر شێخ مەحمود زاڵبن، ئەوان بەتۆپ و فڕۆکەو زرێپۆش هاتن، بەپلانی ووردی ستراتیجی ڕەفتاریاندەکرد لەبەر ئەوە هێزەکەی شێخ کە بە چەکی کۆن و هەستی کوردایەتی هاتبووتە مەیدان توانی بەرگریبکات ئەوە بۆ خۆی شتێکی گەورەیە، بەڵام ئەوە بەتەنها بەسنەبوو بۆ سەرکەوتن بەسەر هێزێکی گەورەی دوژمندا، بەڵگەنامەیەکم دۆزییەوە کە تیایدا باسی ئەوەی کردووە کە چۆن موشیری حەمەی سلێمان لەگەڵ دەستەیەک سەرداری تردا ساڵی 1930 داوای مافی کوردیان کردوە ئەمە وایلێکردم عەوداڵی ڕاستییەم بۆ پاکانەکردنی ئەو پیاوە، تاکە شت کە لەوانەیە ڕەخنەهەڵگربێت ئەوەیە کە موشیری حەمەی سلێمان وەک دەڵێن گوایە ئەو شێخ مەحمودی بەئینگلیز ناساندووە، بەڵام ئەوەش وانییە چونکە حاکمی گشتی بەریتانی "ولسن" دەڵێ من بە چلوپەرگدا زانیم ئەو پیاوە بریندارەی لای ئاشە بەردەکە کەوتبوو شێخ مەحمود بوو.

ئێمە دەبێ هەر عەوداڵی ڕاستیبین وە پێویستە بەووردی شت بخوێنینەوە: دەبێ دڵمان بەوە خۆشبێ کە تۆمەتی خۆفرۆشی لە کوردێک دووربخەینەوە. زۆرکەس لە خوێندەوارەکانمان بە قووڵی و بەووردی ئەو وتارەیان نرخاندووە وەک ئیوا ڕکن ئەجمەدین نەقشبەندی و د. فواد حمە ڕەشید دوو وتاری پشتگیریان لەسەر وتارەکەی من بڵاوکردەوە، وە د. ژتون پیریاری کە لە زانکۆی بەغداد مامۆستایە تەلەفۆنی بۆ کردم ووتی

هەرچەندە جاران دوژمنایەتییەکی زۆر هەبوو لەنێوان هەمەوەندو ئێمەدا بەڵام وتارەکەی تۆم زۆر بەدڵبوو چونکە ویژدان حوکمی تیادابوو. موشیری حەمەی سلێمان لە باوکمە نە مامە. نە دیومە نە ئەیناسم بەڵام فەرمانی مێژوو وابوو کە دەبێ بەرگری لە ڕاستییەکی وونبکەم.

نموونەیەکی ترت پێدەڵێم: عومەر خانی شکاک کە دایە پاڵ دوژمنانی قازی موحەمەد ڕۆژێک لەگەڵ نووسەری ئەمریکی قازی دۆگ لاسدا گفتوگۆدەکەن، کابرای ئەمریکی هێرشێکی زۆر دەکاتە سەر قازی مەحمودو ژمارەیەکی تر لە رابەرە نیشتمان پەروەرەکان، عومەرخانی شکاک خۆی بۆ ناگیرێ‌و بەتوندی بەرپەرچیدەداتەوە: دۆگلاس سەری سوردەمێنێ‌و پێیدەڵێ تۆ لەگەڵ ئێمەی یان لەگەڵ ئەوانی، ئەویش لەوەڵامدا پێیدەڵێ قوربان کورد هەر کوردە. ئەمە لەخۆیدا پەندێکی گەورەیە، زۆولی کوڕ، ئێجگار سەختەو هەرگیز نابێ ئەوە لەیادبکەین. مامۆستا مەسعود محەمەد قسەیەکی زۆر نازداری هەیە دەفەرموێ: "مە، کوردم لامەقبوڵە تا ڕوحی خیانەت" واتە هەر پێی لەم دیرەوەیە. ئەو هەر کوردە.

شیلان: خەڵکانی شارەزای زەمانی پاشایەتی بەخراپ باسی بەکر صدقی ناکەن‌و دەڵێن پرۆژەیەکی بۆ پاشەڕۆژی کورد پێبوو‌و لەم ڕووەوە گ. لێک بەڵگە دەهێنێتەوە، کەچی تۆ لەژێر ئەو بیروڕایانەیت، بۆچی؟

کەمال مەزهەر: بەکر صدقی سەربازێکی لێهاتووبوو، پیاوێکی نازابووە، تکولی لەوە نەکردووە کە کوردە بەپێچەوانەی زۆر کەسی تر بەڵام بەکر صدقی هەرگیزاو هەرگیز کوردایەتی نەکردووە بەڵکو چ خۆی‌و چ بەرقی برای بەحوکمی ئیشەکەیان بەشداریانکردووە لە دامرکاندنەوەی بزوتنەوەی ڕاپەڕینەکانی گەلی کورد، زۆر سەیرە بەکر صدقی نیازی بووبێ بەهۆی سوپای عێراقەوە دەوڵەت بۆ کورد دابمەزرێنێ، ئەمە کام عەقڵ‌و کام مەنتق قبوڵیدەکا، ئێمە بەداخەوە لەبەر ئەوەی مێژوو زولمێلێکردووین دەرفەتی ئەوەمان بۆ هەڵنەکەوتووە بۆیە جەبرانی هەموو یەندو باوێکی لەوجۆرە دەبین، هەزار هەزار خۆزگە بەکر صدقی کوردایەتی بکردایە تاوەکو وتارو کتێبم لەسەر بنووسیایە، دووپاتیدەکەمەوە من مێژوونووسم مێژوو بەلامەوە ڕاستەو لێکدانەوەیە، هەڵسەنگاندنە، ئەنجام دیاریکردنە.

من هەوڵیدەدەم پاکانە بۆ موشیری حەمەی سلێمان بکەم نەی شاخۆ چیم بکردایە لەگەر بەکر صدقی کوردایەتی بکردایە، لەگەڵ ئەوەشدا لای من بەکر صدقی هەر پیاوێکی گەورەیەو زۆریشم خۆشدەوێ چونکە هیچ کاتێک ئینکاری ئەوەی نەکردووە کە کوردە هەوڵیداوە بەپێی توانا یاریدەی ئەفسەرە کوردەکان بدات. بەڵام ئەو لەراستیدا عارەمبێتی دەکرد نەک کوردایەتی من بەچرای ڕۆژگارچەکەوە بەدوویی ئەوانەدا دەگەڕێم کە بە دڵسۆزی کوردایەتیان کردووە.

شیلان: هۆی تێکچوونی بزوتنەوەو شۆڕشەکانی کورد دەگەڕێتەوە بۆچی؟ وەک لەناوچوونی ئەمارەتی بابان/ ڕوخانی کۆماری مهاباد/ تێکچوونی حوکمەتەکەی شێخ مەحمود/ هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلول.

کەمال مەزهەر: کورد لە کۆڕی خەبات هیچ دریغییەکی نەکردووە ڕۆژنەبووە ئەو گەلە دەستبەرداری سەنگەری خەباتبێت بەڵام بەداخەوە جوگرافیا لەگەڵ کوردا زۆر نەیاربووە، کوردستان لە شوێنێکی سەختی دوور لە دەریا هەڵکەوتووە، وڵاتەکەش هێندە خۆش‌و دڵڕفێن‌و دەوڵەمەندە کارێکی وای کردووە لە ڕابردوودا وەک گەلانی تر بەرەو ناوچەکانی نزیک کوردستان بکشێن چونکە کاتێ هەستیان بەوە نەکردووە کە پێویستیان بە دەریاو دەرفەتە، ئەمە هۆیەکی سەرەکی سەرنەکەوتنی خەباتی کوردە لە ڕابردوودا. بەڵام لە مێژووی نوێچەرخدا هۆی سەرەکی ئەو سەرنەکەوتنە دەگەڕێتەوە بۆ سیاسەتی زلهێزەکانی جیهان‌و شۆڤێنیەتی دەستە حوکمدارەکانی ئەو وڵاتانەی کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە. لەوەتەی کورد لەکۆڕی خەباتدایە هیچ کاتێ تەرازووی هێز بەلای ئەودا نەشکاوەتەوە لە ڕابردووشدا کەس لەسەر کورد هەڵینەنەدا نەگینا لە ڕاستیدا کوردەکە بۆخۆی درێغی نەکردووە، هەڵبەت ڕابەرانی کوردیش کەوتوونەتە هەڵەوە، بەڵام هەرگیزاو هەرگیز ناتوانم ئەو جۆرە هەڵانە بەهۆی سەرەکی کەوتنی ڕاپەڕینەکانی کورد دابنێم، هەمیشە باری ئەو ڕابەرانە ئێجگار سەختبووە، ئێمە نابێ بە چاویلکەی ئەمڕۆ لەتەلاری ژیانی خۆمانەوە بڕوانینە خەباتی سەختی ڕابەرانی گەلی کورد. پێش ئەوەی تۆ بێیت بە نووسینی وتارێکەوە خەریکبووم لە وتارەکەمدا باسی نامەیەکی شێخ مەحمودم کردووە کە ئەوروپییەری ساڵی 1932 یان 1933 ناردوویەتی بۆ مەلیک فەیسەڵی یەکەم ئەو نامەیە کە تازە دۆزیومەتەوە، لەدڵی خۆمدا دەمووت بریار هەزار جار دڵنی خامەی شێخی بەردەقارەمان بەر لە نووسینی ئەو نامەیە لە لێدانەدەکەوت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێم ئاخۆ چەند کەس بەرگەی ئەو دەردەسەرییەی دەگرت کە لە مایسی ساڵی 1931 بەسەر شێخ مەحمودا هات دوژمنانی کورد پەتیەتێنیان پێکرد، هەر ڕۆژەی لەشارێکەوە بۆ شارێکی تر دەیانگواستەوە، سەرەتا لە نور پاشان لە ناصریە دوای ئەوە لە حلە پاشان لە عانە، لەرومادیە تا سەرەنجام هێنایانە بەغدادو بە دەستبەسەری تا مایسی 1941 مایەوە، هەر لەناو ئەو بەڵگەنامانەی ئەو قابیلەی کە سەرگوزشتەی دوورو درێژی ئەو ڕۆژە تاریکانەی شێخ مەحمود دەگێڕنەوە، بەڵگەنامەیەکی تێدایە باسی ئەوە دەکات چۆن بەچکە بێرەوشتەکانی شاری حلە بە مووغاوە دووی شێخ مەحمود کەوتوون کاتێک لەسەر یەکێ لە شەقامەکانی شار دیویانە، دیسان دەیڵێمەوە زۆر ئاسانە من لە کتێبخانەکەی خۆمدا دابنیشم ئەو مێژووە هەڵسەنگێنم بێئەوەی خۆم لەنزیکەوە ئاگاداری ئەو دەردو ئازارو بەسەرهاتانەبم کە ئەو ڕابەرانە دیویانە، ئەبێ مێژوونووس یان ڕوناکبیری ووردبین هەمیشە بەوپەڕی ئەوەوە ڕوداوەکان هەڵسەنگێنێ‌و هەرگیز نابێت ئەوە لە لەیادبکا ئاخۆ خۆی دەتوانێت بەرگەی چەند لەو دەردەسەرییە بگرێ کە ئەو ڕابەرانە دیویانە.

شیلان: بەرای جەنابت بیروڕای ئاینی تا چ رادەیەک کاریکردۆتە سەر بزوتنەوەو شۆڕشەکانی کورد، ئایا بەرەو پێشیبردوون یاخود بەپێچەوانەوە کارێکی سلبی هەبووە بۆ سەری؟

کەمال مەزهەر: لەو بارەیەوە وتارێکم بڵاوکردۆتەوە لە پاشکۆی ڕۆژنامەی عێراق کە بەکوردی دەردەچێ بەناوی ئیسلامی سیاسی ئەو وتارەم لە چوار ژمارەدا بڵاوکردۆتەوە، زۆر حەزدەکەم ئەو وتارە بخوێنیتەوەو پوختەکەی بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە ئەوەیە، هەرچۆنێکبێت سەرنجی من وەهایە کە کورد بەدل بوونەتە موسڵمان وە خزمەتی شارستانێتی ئیسلامیان کردووە هۆی سەرەکی ئەم دەورە بەم جۆرە لێکدەدەمەوە، کەلەسەدەی "6"ی پێش زاین دەوڵەتی میدیا ڕوخا کورد دەستەڵاتی لەدەستداو بوونە گەلێکی چەوساوەی ژێردەستی ساسانییەکان کە لەگەڵیاندا زۆر خراپ بوون، موسڵمانەتی هەرچۆنێک بێت جۆرە برایەتی‌و یەکسانییەکی بۆ هێنان یا باڵێین دۆخی کورد لەژێر سایەی ئیسلامدا کەوتە بارێکی باشتر وەک لەوەی ڕۆژگاری ساسانییەکان، لەوانەیە ئەوە ڕەنگێکی زۆر دڵسۆزانەی کورد دابێتەوە بەڵام ئەوەی کە جێیداخە ئەوەیە وای هەستدەکەم ئیسلامییەکانی لای خۆمان کەمتر پەرۆشی مەسەلەی کوردن بەپێچەوانەی ئیسلامەکانی تورکیاو ئێران‌و وڵاتە عەرەبیەکان کە هەوڵدەدەن لەرێگەی ئیسلام نەتەوەکەی خۆیان بەرزبکەنەوە، دەبێ ئیسلامییەکانی کوردستانیش بەر لە هەرشت بیر لە نەتەوەی کوردو دوارۆژی نەتەوەی کورد بکەنەوە.

شیلان: پەیوەندیت بەهیچ حیزب‌و ڕێکخراوێکەوە کردووە لەژیانتا؟

کەمال مەزهەر: سەرەتای ژیانم چەپ ڕەوبووم لەگەڵ کۆمۆنیستەکاندا ئیشم دەکرد تا چووم بۆ خوێندنی باڵا بۆ وڵاتی شورەوی لەوساوە بەیەکجاری خۆم بۆ مێژوو تەرخانکرد هەرچەندە دەزانم ژیان هەمووی سیاسەتە، یەکێکی وەک من ناتوانێ دوورەپەرێزبێت، هەمیشە کوردایەتیمکردووەو کوردایەتیدەکەم چونکە واسەبێت ناتوانم ڕێز لە خۆمبێنم ڕێزی خۆشم بۆ خۆم لەسەرو هەموو ڕێزێکی ترەوەیە.

شیلان: وەک پێشتر ئاماژەتپێدا زۆر لە شورەوی بوویت هەردوو دکتۆراکەت لەوێ هێنا. ئایا ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە کۆتایی هەشتاکاندا بەسەر سۆڤیەتدا هات چۆنی دەبینی؟

کەمال مەزهەر: ڕوخانی وڵاتی شورەوی ڕوداوێکی ئێجگار گەورەو جەرگبڕە، ئێمە هەموو جاران چاوەڕوانی ئەوەبووین ڕژێمە سەرمایەدارەکان بڕوخێن، جێگەی داخە ڕژێمێکی سۆشیالیزمی وا گەورە لە پڕ ئاوی لەناو ئاوادا نەمێنێ، ئەو مەسەلەیە زۆر قووڵە پێویستی بە لێکدانەوەی فکری‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و مێژووییە، من تا ئێستا چەند جارێک لە دەزگا ڕۆشنبیرییەکانەوە داوایان لێکردووم محاجەرەیەک تایبەت لەسەر ئەو مەسەلەیە بڵێمەوە وە پێش سێ ساڵ لەمەوپێش لە عەمان لە کۆڕدێن داوەتی تایبەتی کرام بۆ محاجەرەیەکی لەو بابەتە وە من

## پاسەوانێکی خەرمانی

# ئەدەبی کوردی لەناو فایلەکانی وەزارەتی کاروباری ناوخۆدا



پێشکەشتە بە هەڵەوەری خۆشەویستت[1] (( قارەمانی سێنەمی مەیدانی شیعر لە پەرەبابی صاحێبقران، پاسەوانی بە خەمی ئەدەب لەم دەورەی دوایی کوردان، دلێبەندی پیرۆزی قسە بە هەموو تینێکەوە، سەقتون بە فیکری فەلسەفە لە هەموو باس و خواسێکا، تەشبیهپەرست و خەیال درووست لە هەموو کاروبارێکیا )).
بەم جۆرە پڕ سۆزە مامۆستا سەجادی دەست بە گێڕانەوەی سەرگوزشتەی ژیان و هەڵسەنگاندنی بەرهەمی کەم وێنەی شاعیری بە دیمەنی گەورەی کورد حەمدی، دەکات[2].

حەمدی، کە نازناوی شیعریی ئەحمەدی کوڕی فەتاح بەگی صاحێبقرانە، ساڵی 1876 لە سلێمانی لە دایک بووە، هەر لەوێش ساڵی 1936 کۆچی دوایی کردووە. لە بنەماڵەی کوردی و سالمە، لە سەرەتای دروستبوونی دەستەی ڕووناکبیری نوێی کوردەوە حەمدی لە ڕیزی پێشەوەی ئەو دەستەیەدا بوو. وەک کورد پەروەر شەڕی دەربەندی بازیان و ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیران و داستانی ناوبارێکی قارەمان و کۆمەڵی ژانستی کوردان و نەورۆز و چیاو کێوی کوردستان بوونەتە بەشێکی بەرچاوی زادی هەوێنی شیعرەکانی. حەمدی لەگەڵ خۆی و ئەتەوەو نیشتماندا سەر ڕاست و دەستخاوێن و دووربین بوو، بۆیەکا بە وێنە، کەی بە پێویستی زانیوە ڕەخنەی توندوتیژی لە شێخ مەحمود گرتووە، کەییش بە ڕاستی زانیوە بەرزترین ئاوازی بۆ گوتوە.
ئەو پاسەوانە بە خەمەی خەرمانی ئەدەبی کوردی شێخ ناوبارێکی بەم بەیتەی گەیاندۆتە کەشکەلانی فەلەک:

/ ڕەبیبی مویلێبێ زوبیانی، پەنجەکانی هەڵوەری / هەرکەسێ گۆڵشەن بە دەردی کولخەنی دۆزەخ بەرێ / شاکارەکانی حەمدی هەر زوو لەناو ڕووناکبیرانی کوردا دەنگیان دایەوە، بۆیەکا دوان لە بەپەرۆشە دڵسۆزەکانیان لە ناوەندی سییەکانەوە بۆ یەکەم جار هەوڵی چاپکردنی دیوانەکەیان دا، یەکەمیان مەلا ئەحمەدی دینی مەلا غەفوورە کە هەر بە مەلا ئەحمەددین مەشهوورە و، دووەمیشیان حسەین حوزنی موکریانییە کە لەو ساڵانەدا بە خۆی و چاپخانە نیوداشتەکەیەوە لە ڕەواندزەوە کوردستانی ڕووناک کردۆتەوە.
ئەحمەددین مەلا کۆکردنەوەو ئامادەکردنی دیوانەکەی کەوتە ئەستۆ، حسەین حوزنیش چاپکردنی. ڕاپۆرتنووسە کوردەکان بە نهێنی دەزگاکانی میری ئەوە ئاگادار دەکەن کە بەشێک لە بەرهەمەکانی حەمدی بە هەستی کوردایەتی جۆشدراون. بەستوێرد دایەرەی ئەمن، کە ئەوساکە ناوی تەحقیقاتی جینائی بوو، دەکەوێتە خۆو خەفیەکانی بەخاتە گەڕ بۆ سۆراغی ئەو جورمە گەورەیە.
تەحقیقاتی جینائی ڕۆژی شەشی مارتی ساڵی 1935 یادداشتێکی نهێنی لەم بارەیەوە ئەدا بە وەزارەتی کاروباری ناوخۆ کە ئەمە دەقەکەیەتی:

(( وەک زانیومانە مەلا ئەحمەددین، کە خاوەنی کتێبخانەیەکە لە سلێمانی، دیوانی شاعیری بەناوبانگ ئەحمەد بەگی کوڕی فەتاح بەگی دۆزیوەتەوە، لەناو دیوانەکەدا ئەم باسانە هەیە:

– باسی بزووتنەوەکانی شێخ مەحمود لە کاتی شەڕی ناوبارێکدا.
– باسی بارودۆخی کوردی باکوور ( کوردستانی تورکیا ) و شێوازی خەباتیان و بیروباوەڕی ڕووناکبیرانیان لە پێناوی ئازادیی کوردا.
– ژیانی سەختی کورد تا ئیمرۆکە و زوڵمی دراوسێکانیان.
– هەروەها لەوە دەدوێت کە چۆن دەبێت کوردیش فریای خۆیان بکەون تا دووچاری ئەو ئەهامەتییە نەیەن کە کوردەکانی باکوور (کوردستانی تورکیا) لە ڕۆژگاری شۆڕشە بەناوبانگەکەیاندا پێوەی گیرۆدە بوون.
– شایانی باسە ناوبراو (واتا ئەحمەددین مەلا) بەم زووانە دەست دەکات بە چاپکردنی دیوانەکەو بەو کارەی شارەزووی دانیشتوان و لاوانی شاری سلێمانی وەدی دێنێت. ئەوانەی هانیان داوە بۆ ئەو کارەو پەیمانیان داوەتێ هەر دانەیەک لەو دیوانەی بەشێو دینار لێ بکڕن. ئیمزا: بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس.
خوێندنەوەی گشت لایەنەکانی ئەم یادداشتە بۆ هەموان کارێکی زۆر ئاسانە. لە هەمووی دژوارتر ئەوەیە کەشاعیری کورد نابێت باسی دەردو ئازاری ئەتەوەکەی بکات، جا با ئەو دەردو ئازارەش هی کوردەکانی کوردستانی تورکیا بێت کە ڕۆڵی گەورەیان لەوەدا بینی ویلایەتی مووسڵ بدرێتە پاڵ عێراق نەک تورکیا. لە یادداشتەکەیدا جەنابی بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس تەنانەت باسی ئەوەش ناکات کە حەمدی ی شاعیر دڵسۆزی برایەتی کوردو عەرەبە، هەر ئەوەندا، بەڵکو بەو ئەوپەڕی سۆزو تەقدیرەوە باسی "خاوەن شکۆ فەیسەڵی یەکەمی" کردووە کە بە بۆنەی تەشریف هێنانییەوە بۆ سلێمانی، بەڵای شاعیرەوە، مانگ کەوتۆتە هەڵپەڕکێ و لەخۆشیدا "وەک ئەختەر" جریوەی لێ هەڵستاوە تا حەمدی وای لێهاتووە پێی وابێت بەم بۆنەیەوە سلێمانی "بۆتە جەنەت و مەحشەر"، وادیارە ئەوپیانە بفەر ئەمیانەش واجیبە، واجبیش، بێ گومان، پێزانینی پێ ناوێ "لاشکر علی الواجب".
بەڕێز وەزیری کاروباری ناوخۆ هەر ئەو ڕۆژە لە داوێنی یادداشتەکەی بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیسدا فەرمان دەدات پارێزگاری

